**بسم الله الرحمن الرحيم**

## 👌 پێشـەکی:

الحمدلله ...والصلاة والسلام على رسول الله... وعلى اله وصحبه ومن والاه ...

**ئارامی دڵ وخۆشی وبەختەوری ئاواتی هەموو کەسێکە،سەرجەم مرۆڤەکانیش بەشوێن شتێکدا دەگەڕێن کە ئاڕاستەی ژیانیان بگۆڕێت بۆ باشتر ،وەك ئەو پیاوەی کە لەڕۆژێکی روناکدا مۆمێکی بەدەستەوە بوو لێیان پرسی لە چی دەگەڕێیت ؟ووتی بە شوێن خۆم دادەگەڕێم ئێمەش بۆ گەیشتنمان بەو خۆشی و شادی یە ئەبێ هەوڵبدەین و بگەڕێین و بۆ بەدەست هێنانی هۆکارەکانی بەختەوەری ژیان ،بۆ کەم کردنەوەی خەمـەکان ،بۆ ئەو مەبەستەش کۆمەڵێك هۆکار هەن وەك هۆکارەکانی (دین ،سروشت،کردار)کەتەنها بۆ بڕواداری ڕاستەقینە ئەم شتانە کۆدەبنەوە ،بەڵام بۆ خەڵکانی تر ئەگەر لایەنێکی ژیانیشی تێرو تەواو بێت بەهۆی سەروەت و سامان و کاری ژیرانەی ،ئەوە لەچەند لایەکی ترەوە ناتەواوە.لێرەدا هەوڵم داوە کە ئاماژە بکەم بۆ ئەو هۆکارانەی کە ئەمان گەیەننە لوتکەی بەختەوەری ،هەیە زۆرێك لەو هۆیانەی دەستەبەرکردووە و بەهۆیەوە ژیانێکی خۆشی و شادی گوزەراندوە ،هەشیانە مام ناوەند بووە و هەندێکیشیان سەرەڕای سەروەت و سامانی زۆر چێژیان لەژیان نەکردووە و ژیانیان لێ بوەتە ژان !جا بۆئەوەی بگەی بە لوتکەی سەرکەوتن و بەختەوەری ...،بۆئەوەی ببیتە پێشەنگی چاکەکاران ..بۆئەوەی گۆڕانکاری ڕیشەیی لەناختدا دروست بکەیت.. بۆئەوەی بەسەرکۆسپەکانی ژیاندا زاڵ بیت .. بۆئەوەی سەرفرازی دونیاو دواڕۆژبی ..تێبکۆشە ،بەهەوڵدانەوە بژی و بەهای ژیان بزانە.. بەئاواتە بژی ..بەئیمانەوەبژی بەخۆشەویستی یەوەبژی، لەفەرموودەدا هاتووە:**{منَ استَوى يوماهُ فهوَمغبون} **واتە:هەرکەس دوو ڕۆژی وەك و یەك بێ ئەوە دۆڕاووتێك شکاوە،ئەبێ ئەمڕۆمان لە دوێنێ چاکتربێ .هاوشێوە مانای سەرەوە( ڤۆڵتۆن) یش وتویەتی: (مرۆڤی بەختەوەر کەسێکە کەلەخەوهەستا بەخۆی دەڵێ :هەوڵ دەدەم ئەمڕۆ لە دوێنێ باشتربم ). دیارە لەسەر بەختەوەری کتێبی تریش نوسراون و هەریەکەشیان بەشی خۆی سودوکەڵکی بووە ، چونکە تەوەرەکە زیاتر هەڵدەگرێ کەلەسەری بنوسرێ ، ئەوەی کەناچاری کردم بۆ دوبارە هەڵبژاردنی ئەم بابەتە ئەوەیە کە سەرەڕای پێشکەوتنی ژیان لەڕوی مادییەوە ،بەڵام خیانەت وگەندەڵی و بێزاری و خەم باری و بێتاقەتی و ڕەشبینی خەڵکیش لە زیاد بوندایە.. شنەی شەماڵی شادی کەمە و نایە !جا بۆ دیاریکردنی دەرد و دەرمان ، بۆ خزمەتی گەلی خۆمان ، دەستم دایە نوسینی هۆیەکانی بەختەوەری.. بۆژیانێکی پڕسەروەری ، بە هیوای ژیانێکی خۆش بۆ من و تۆش ، بەئومێدی بەختەوەری دنیاو دواڕۆژ.**

مەلا ئەحمەدی قامیشی

سلێمانی/مزگەوتی شەفیق بەگ

مۆبایل/ 07701473902

## بۆئەوەی بەختەوەرترین کەس بیت

* ئیمانی پاك داینەمۆی ژیانە،ڕێگای ڕوناکی موسڵمانە، لابەری خەم وخەفەت و گوڤانە،بەختەوەری هەردوو جیهانە .        *بگەڕێ بەشوێن زانیاری دا پێشکەوتنە،زاڵبون بەسەر نەزانیندا گەورە ترین سەرکەوتنە.

* بزانە کەزیکری خوا ئارامی دڵانە، لابەری خەم وتاوانە، هەربەوەش ڕازی دەبێ خودای تاقانە،کلیلی دەرگای خۆشیانە .   * قورئان خوێندنی ڕۆژانە، مانا و مەبەستیشی بزانە ، شیرین ترین کردەوەی موسڵمانە ،لەگەڵ قورئان بژی گیانە.        *تەوبەکەت نویێ بکەوە ،لەگوناهو تاوان دوربکەوە،چون لاری وخواری وستەم وتاوان،ژیانت لێ دەکات بەژان.        *پاداشتی چاکە هەر چاکەیە ،دەی لەگەڵ خەڵکدا چاك و پاك بە ،کردار وگوفتاری جوان..خۆشی یە بۆ ناو دڵان. *

بەختەوەری بە بنەماڵەوپلە وپایە نی یە،بەسەروەت وسامان نی یە بەڵکو بە(دین و عیلم و ئەدەبە).

* ئازاو بەغیرەت بە شادی دەروونە ،مرۆی ترسنۆك  هەردەم زەبونە ،پێش ئەجەلیشت نامری لەم ژینە.

* دڵت پاك بکەرەوە لەکینە و حەسودی و غەش و خیانە ،  کەنەخۆشی و ژەنگی دڵانە ،مایەی ناخۆشی ژیانە .

* قەناعەتت بێ بەو بەشەی خوا پێی داوی، ئەندازەی هەموو شتێ لای خوا دیاریکراوە ،واز بێنە لە هەڵپە و هیلاکی چاو ڕاوە .

* وابزانە هەر ئەمڕۆ دەژی وئەم ڕۆژە مڵکی تۆیە ،دوێنێت لەدەست چوو ،داهاتوش نادیار و نامۆیە .

* مێشکی خۆت ماندوو مەکە بە دوای خەم وخەیاڵی ڕابردوو، ڕابردوو کەڕۆی ناگەڕێتەوە، یادگاری وخەفەت نایهێنێتەوە .

* سەیری خوارخۆت بکە بۆبژێوی ژیان،تەماشای سەروی خۆت مەکە،خۆت دوچاری خەفەت مەکە چون لەتۆش خراپتر هەیە.        * بەختەوەر ئەو کەسەیە:پەند لە ڕابردوو وەردەگرێت،گەرم        وگوڕە بۆ ئێستای،گەشبینە بۆ داهاتووی .

*توڕەمەبە،توڕە بوون لەشەیتانەوەیە،سەرەتاکەی شێتی یە وکۆتاییەکەی پەشیمانیە .

* کێشەکان گەورە مەکە ،بەئەندازەی قەبارەی خۆی بۆی بڕوانە .

*بیر لە خراپە مەکەرەوە ،خۆت دەرباز بکە لە چاوەڕوانی بیر و خەیاڵی خراپ گەشبین بە لەژیاندا.

*بونەوەر بەیاسا ڕێکخراوە و دروست بووە ، تۆش پێویستە لەکارەکانتا لەدەرەوە و ماڵەوە بەیاسایی بجولێیتەوە .

*گورج وگۆڵ بە لەکارەکانتا و کاری ئەمرۆ مەخەرە سبەینێ .

*خۆت بەکارێکی چاکەوە خەریك بکە بۆ ئەوەی توشی خەیاڵی خراپ نەبی ودڵتەنگت بکات ، بێ کاری نەخۆشی یە .

*کارەکانت بالەبەرخوابێت وچاوەڕوانی سوپاسی کەس مـەکە .

*گوێ مەدە بەوانەی لۆمەت دەکەن ،چونکە ئەوانە زیان بەخۆیان دەگەیەنن بەغەیبەت وبوختان .

*نیعمەت و خۆشیەکان بێنە بەرچاوی خۆت و بەراوردی بکە لەگەڵ ناخۆشیەکانا، بزانە تۆ چەند لەخێردای .

*دورکەوتنەوە لە ئیسراف و زیادە ڕەوی ،مامناوەندبە(وَسَط)ی لەهەموو شتێکدا خێروچاکە ، لەقەدەربەڕەکەت پێ ڕاکێشە، ئاسودە و بەختەوەر دەبی بێ کێشە .

*گرنگی بدە بەوەرزش تەندروستی لاشەی تێدایە ، چون بیروهۆشی چاك وتەواو لەلاشەی ساغ دایە.

*گرنگی بدە بەپاك وخاوێنی،چون پاکی دڵ وزمان وبەرگ و دیمەنی جوان وبۆنی خۆش،سودمەندە بۆ ئارامی دڵ و هۆش .

*وەلأمی خراپە بە چاکە بدەرەوە ،ئەوەی نایە بۆلات تۆ بەسەری بکەرەوە خۆشی بخەرە دڵتەوە .

* سوپاسی خوابکە لەسەر نیعمەتی (دین و عەقڵ و لەش ساغی و ماڵ مناڵ و حەیا و حورمەت )

* زیکری (استغفروا الله )دەرگای ڕزق ورۆزی وخۆشـی ژیانە ..هۆکاری سڕینەوەی گوناهو تاوانە .

*زۆر ووتنی(لاحول ولا قوە الا بالله)گرفتەکان لا دەبات وکارەکان ئاسان دەکات ،خوداش ڕازی دەبێ،شادی هێنەرە خەم لابەرە .

* پشت بەخوا ببەستە دەبیتە بەهێز ترین کەس .

* هیچ کات مەڵێ کێشەیەکی گەورەم هەیە، بەڵکو بەکێشەکە بڵێ خوایەکی گەورەم هەیە .

* ژیانت بگۆڕە بەتازەگەری وداهێنان،دوورکەوە لەتەمبەڵی وگەندەڵی وڕۆتین،بەختەوەردەبی لەژین .

*ڕازی ببە بەماڵ وحاڵی خۆت،دورت دەخاتەوە لەحەسودی ، قەناعەتت بۆدروست دەکات،قەناعەتتیش گەنجینەیەکی نەبڕاوەیە

* گەشبین بەوڕەشبین مەبە،بەئیجابی بیربکەوەوهەڵسوکەوت نکە.

* بزانە کەدوای هەموو ناخۆشیەك خۆشی هەیە،نائارامی وفشارەکان خۆشی وشادی بەدواوەیە ,

* ناخۆشیەکانی ژیان کەفارەتی تاوانە،بۆ کەسانی لەخۆبایی دەرمانە.

* بزانە کە هەرتۆ توشی ناخۆشی نەبووی بەتەنیا ،کەس بیٚ خەم نی یە،ژیان تاقی کردنەوەیە بەخۆشی و ناخۆشی .

*وەکو خۆی بەرەوڕوی ناخۆشیەکان بوەستەو بەئیمانەوە بشت بەخوا ببەستە ،سەبربگری پاداشت وەردەگری .

* بەختەوەری مانای نەبوونی کێشە نی یە ،بەڵکو بەختەوەر ئەوکەسەیە کەتوشی کێشەیەك بوو نەڕوخیٚ ونەشێویٚ ، نەخشەدابنیٚ بۆچارەسەرکردنی .

* هاوڕێیەتی پیاوخراپان مەکە،چونکە مرۆڤ لەسەردینی هاوڕێکەیەتی حیسابی ئەوانت بۆدەکریٚ.

* ئاگاداری نوێژی بەکۆمەڵ بە لەمزگەوت،پەیوەست بون بەمزگەوت ونوێژ..خۆشیە بۆ دنیاو دوارۆژ .

* نانی حەلاڵ،بدە بە ماڵومناڵ،عیبادەتی حەرامخۆر وەرناگیریٚ بە هیچ جۆر

*پارانەوەی بابەودایە..بەختەوەری لەدوایە..وەفاداری و بەقایە..بۆهەردووجیهان پشت وپەنایە .

* بۆ رەوینەوەی خەمەکان..بۆئارامی دڵ وگیان..بۆبینبنی جوانیەکان..بگەڕیٚ لەگەشت وسەیران .

* دوربکەوە لەدڵەڕاوکیٚ وڕاڕایی ،لەڕوخان وترس وبێئاگایی،خاوەنی هەڵوێست وبڕیاربە .

* روانین بۆحەرام (نَظَر)خەموخەفەتە،پاراستنی چاو شادی ورەحمەتە.

* سەرقاڵ بوون بەڕابردوو نەفامیەو بەلاشە..وەك دووبارە ئاردبکەیتەوە بەئاشا،ڕابردوو بەسەرچوو..

* لەش ساغی تاجی پاشایەتی یە..قەناعەت دەوڵەمەندییە..دینداری بەختەوەرییە....

* نیشانەی بەختەوەری سیانە:ئافرەتی پەروەردەکراووجوانە، خانەولانەی فراوانە، سەیارەی شیاوی زەمانە.

* بەختەوەر: فاسق نابیٚ نەخۆش نابیٚ!قەرزارنابیٚ غەریب نابیٚ !خەمبارنابیٚ !بێزارنابیٚ !..

* دڵخۆشی ئاڵتون وگەوهەرە،خەموخەفەت داپۆشەرە ،توڕە بوون سوتێنەرە،بێکاری خەم هێنەرە عیبادەت بازرگانی هەردووبەرە,

*بەختەوەر کەسێکە لەنیعمەت وخۆشی داسوپاسگوزارە ، لەکاتی ناخۆشیدائارامی پێوە دیارە،لەدوای گوناهوتاوان ڕولەتەوبەو

استغفارە،حوکم وبڕیاری گونجاوولەبارە .

* کردەوەت چاك بیٚ..ئاواتت کەم وپاك بیٚ..مردنت لەبەر چاوبیٚ..وەك ئەمرۆت لەژیاندا مابیٚ ..کاری

* تەمەن کەمەو ڕادەبرێ وەکو ڕۆژانەت ئەنجام دابێ ،لەژیانت بەئاگابی
بادی سەباوایە..حەیف بۆوعومرە سەرفی کەین بەبێ هودە لەدنیایە
* گەرهەموو دنیا بەریتەوە بەلاَم خۆت بدۆڕێنی بەهیچ ناچێ .

## بـەرەوگـــۆڕان

﴿ إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ ﴾ (الرعد/11)

واتە:بێگومان خوانازونیعمەتی لەهیچ گەل وکۆمەڵێك ناگۆڕێ ولێیان تێك ناداتائەوان خۆیان نەگۆڕن بەرەولاری وخواری خراپە،کەواتە پێویستە خۆمان هەولْ بدەین بۆگۆڕان لەخراپەوەبۆباش ولەباشەوە بۆ باشتر،بۆگەیشتن بەبەختەوەری ئەبێ ئەوگۆڕانەلە خۆمانەوەدەست پێ بکات لەسنورە فراوانەکەی شەرعدا،ئەبێ ببینە مامۆسـتای گۆڕانکاری نەك قوربانی ئەو ،نەك ببینە سوتەمەنی هەندێ داب ونەریتی خراپی ڕابردوبە پاساوی ئەوەی کە لەسەری ڕاهاتوین،کەواتە ئەبێ هەوڵی بەدەست هێنانی بدەین شتێك نییە بۆخۆی بێت،ئەبێ هەنگاوبنێین بەرەو گۆڕانکاری لەناخمانداڵەژیانماندابۆبەدەست هێنانی هۆیەکانی بەختەوەری،بەلاَم بیرت نەچێ ئەبێ سەرەتا لەخۆمانەوە دەست پێ بکەین

{کاتێ لاوێکی سەربەست بووم بیرکردنەوەکانم سنوریان نەبوو خەونم بەگۆڕینی جیهانەوە دەبینی، پاشان بۆم دەرکەوت کەجیهان ناگۆڕێت،لەبەرئەوەویستەکانم کەمکردەوە تاگەیشتەئەوەی کەبڕیارمدا ولاَتەکەم بگۆڕم،دواتربۆم دەرکەوت ولاَتەکەشم وەکوخۆیەتی وناگۆڕێت،کاتێ گەیشتمە تەمەنی پیری کۆتا هەوڵی خۆم دا بەگۆڕینی خێزانەکەم ودەوروبەرم،ئەوهەوڵەشم بەدۆڕان کۆتایی هات،لەکۆتایی ژیانم دا دەرکم بەوەکردکەخۆزگەهەرلەسەرەتاوەدەستم بکردایە بەگۆڕینی خودی خۆم..پاشان هەوڵم بدایە بۆگۆڕینی خێزانەکم،پاشان بەهاوکاری ئەوان لەوانەیە بمتوانیبایە دەستم ببێت لەبەرەو پێشچونی ولاَتەکەم داپاشان بمتوانیایە جیهان بگۆڕم } . (وتەی دانایەك )

دیارە گۆڕانی ڕیشەیی وکردەیی وزالْ بون بەسەر نەفس ونەریتە خراپەکاندا (ئەمربەچاکەوڕێگری لەخراپە) کارێکی هەروا ئاسان نی یە و ماندوو بوون و بەئاگابوون وهۆشیاری دەوێ پێویستیت بەهەندێك ئالیەت و میکانیزم دەبێت کەلەسەروی هەموویانە بیرو باوەڕێکی چاك و پاك و پتەوە کەلەعەقیدەی ئیسلامیدا خۆی دەبینێتەوە،هەرلەبەرئەوە لە سەرەتاوە بەم هۆکارە دەستم پێ کردوە بۆ گۆڕان بەرەوڕاستی وچاکی و پاکی تاکودەگەینە بەختەوەری وئاسودەیی. بەداخەوە کەلەم ڕۆژگارەماندا نەوەیەکی تەمبەلْ هاتونەتە پێش وپاڵیان داوەتەوەو گوێ نادەن بە

گۆڕانکاری وداهێنان وستراتیج وفەلسەفەی ژیان.

**{ هەرگیز بۆگەیشتن بەئەوەی کەئەتوانی پیَ ی بگەیت درەنگ نی یە}**

**(وتەی بەنرخ)**

## بیروباوەڕ ژیانە

**گەورەترین هۆکاری بەختەوەری ژیان بۆ مرۆڤەکان بیرو باوەڕە ،باوەڕی چاك و پاك چرای دڵانە،داینەمۆی ژیانە ،چونکە مرۆڤ هەرچی دەیکات لەژیانی دا ڕەنگدانەوەی ئەو بیروباوەڕەیە کەلە مێشکی دایە، ژیانی چاکوپاك زادەی بیروباوەڕی چاکوپاکە،کەواتە باوەڕ ژیانە، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ (النحل / 97) واتە :**

**هەرئیماندارێك نێربێت یان میَ کارو کردەوەی چاك بکات ، ئەوەلەدنیادا بەشادی و کامەرانی دەیژێنین ،وە لەڕۆژی دوایشدا بەگەلێك باشتر پاداشتیان دەدەینەوە، ئەمە وەعدی خوایە کە بڕوادار بەختەوەرە لەدنیادا ،چونکە بەرهەمی ئیمان کردەوەی چاك و پاکە کردار و گوفتاری شیرینە بەوەیش خۆشی دەکەوێتە نێودڵی ، بەڵام بەبیَ ئیمان و باوەڕ ژیان ژانە ، چونکە ئەوەبەرهەمی بیَ بڕوایی یە کەسەرەڕای تەکنەلۆژیای سەردەم، قەیران و کێشەکان لەزیادبوون دان ،وڵات لێوان لێوە لە گەندەڵی و خیانەت !   خەڵکی بێزار و خەمبارە ، ساڵیَ بۆساڵیَ خۆزگە بەپارە،ئێستابۆ جیهان دەرکەوتوە کە بەبیَ باوەڕ ژیان مەحاڵە بەختەوەری دەستەبەربکات ،ژیان لە بیَ باوەڕیدا خەم و خەفەت و کێشە و ئاڵۆزی و نائارامی یە ،وەك خوای گەورە فەرمویەتی {من اعرض عن ذکری فان له معیشة ضنکاً} دیارە ژیان تاقی کردنەوەیە بەخۆشی و ناخۆشی ،تەنها ئیمانداری ڕاستەقینەیە دەتوانیَ لەهەردوو بارەکەدا ئارامی دەروونی دامەزراوی بەدەست بێنیَ وەك پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی{عجبا لأمرِ المؤمن اِنَّ اَمرهُ کلهُ خَیر ...}واتە:    کاری بڕوادار جێگەی سەرسوڕمانە کە هەمووکات لە خێردایەو لە کارەکانی دا خێری بۆ دەنوسریَ ، چونکە ئەگەر کەوتە خێر وخۆشی سوپاسی خوادەکات وخێری بۆ دەنوسریَ وە ئەگەر توشی ناخۆشی بوو ئەوە ئارام دەگریَ و خێری بۆ**

دەنوسرێ ،ئەوە تەنها بۆ بڕواداره کەلەهەردووبارەکەدا لە خۆشی و ناخۆشی دا لەسایەی ئیمانەکەیدا خێری بۆ دەنوسرێ ،خێری سوپاسگوزاری و ئارام گرتن، کەدەبنە هۆی ئارامی دڵ و بەختەوەری دنیا و دواڕۆژ ،بۆیەدەبینی کەدووکەس دوچاری خۆشی یان ناخۆشی دەبن،هەڵوێستی هەریەکەیان جیاواز دەبێت بەپێ ی ئەوبیروباوەڕەی کەلەمێشکی دایە،بۆنمونە مسڵمانی ڕاستەقینەکەتوشی نەخۆشی وهەژاری ونەداری بووبەهۆی ئیمانەکەی قەناعەت ڕازی بون وئارامی بۆدرست دەبێ،وەك خەڵکانی دنیایی ناکەوێتەهات وهاوارو ناشکوری وخراپەکاری،وەئەگەر کەوتەخۆشی یەوەو دەوڵەمەندبوو یان سەرکەوت ،لوت بەرزوبایی نابێ و لەحەق لاناداو وکەسایەتی خۆی دەپارێزێت وبەردەوام کردارو گوفتاری شیرینی ئیمانی لێ دەبینرێ،ئەم دوو حاڵەتەجیاوازە لە شین وشایی دا لەم ڕۆژگارەدا بەزەقی دەبینرێ. خۆکافرومسوڵمان،چاك وخراپ هەردولایان هاوبەشن لەخۆڕاگری وئازایەتیدا بەرامبەر ناخۆشی یەکان بەلاّم مسوڵمان بەهێزی باوەڕی ئارامگرتن وپشت بەستنی بەخوداو ئومێدی پاداشتی دواڕۆژ ئازاترو دامەزراوتر دەبێت وئازارەکانی لەسەر سوك تردەبێت وەك خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمونَ وَتَرْجُونَ مِنَ اللّهِ مَا لاَ يَرْجُونَ وَكَانَ اللّهُ عَلِيماً حَكِيماً﴾ (النساو/104)واتە:لەکاتی ڕوبەڕوبونەوەدا کەئێوە ئازارونارەحەت دەبن،ئەوانیش وەك ئێوە ماندوودەبن، بەلاّم ئەوەی ئێوە بەتەمان وچاوەڕێین لەپاداشتی دواڕۆژ ئەوان نیانە. بۆیە باوەڕ بە خوا ژیانێکی ئارام بۆ خاوەنەکەی دەستەبەر دەکات، چونکە هەرخوایە بەختەوەری دەبەخشێت ،بەختەوەری و ئاسودەیی دڵ و دەرون تەنها لە باوەڕەوەیە، بەومەرجەی دەستگرتوو پابەندبین بەبنەماکانی بیروباوەڕ .

## متمانە بەخۆبوون*

### ( گەورەترین توانا لە بڕوابەخۆبوندا یە) (باب جۆنز)

دوای وەرگرتنی بیرو باوەڕ بەشێوەیەکی ڕاست و دروست ،ئەبێ ئەوباوەڕە بنەما و هاندەری سەرەکی بێت بۆ متمانە بەخۆبوون و هەنگاونان بەرەوگۆڕانکاری بۆ ژیانی بەختیاری.، زانایانی دەرون ناسی پێناسەی جیاوازیان هەیە بۆ متمانە بەخۆبوون لەوانە : :

* متمانە بەخۆبوون واتە :هەوڵدان بۆ گەیشتن بەخەون و ئاواتەکان

* گەشەدان بەتواناکان و ڕێزگرتن لەخودی خۆت بە شێوەیەك باوەڕت بەخۆت هەبێ کە تۆ شایەنی سەرکەوتنی لە کارەکانتا. * هەست کردنی مرۆڤە بەڕێزوبەهاو توانای خۆی لەناودەوروبەری دا، وەگرتنەبەری ڕێگاکانی سەرکەوتن لەژیاندا. بێگومان متمانەبەخۆبون گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لەبواری دەرونی وبۆ هاوسەنگ ڕاگرتنی کەسایەتی لەمرۆڤدا، بەنەمان و لەدەستدانی متمانە باری دەرونی مرۆڤ تێك دەچێت و توشی دڵە ڕاوکێ و ترس وبیم و هەستکردن بە ناتەواوی و تۆمەت

**<u>بارکردنی بەرانبەردەبێت</u>،متمانە بە خۆبون شتێکی گران بەهایە** *متمانە بەخۆبوون / ئەنوەراحمد مصطفی.

**ئەوکەسەی کە شایەنی نیە ناتوانیٚ بەدەستی بێنیٚ ، بەتایبەت لەسەردەمێکی وەك ئەمڕۆماندا کەسەردەمی ململانێکانە و کەسی سەرکەوتوو لەو هەرایەدا ئەوکەسانەن کەمتمانەو باوەڕیان بە خۆیان هەیە لەژیاندا . لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخستوە کە ئەوکەسانەی توانیویانە بگەنەپلە بەرزەکان لەژیانی دونیایاندا ئەوانەن کە متمانە و باوەڕیان بە خۆیان هەیە .بیٚ متمانەیی بوەتە قەیرانێکی ئەم ڕۆژگارە ، دەبینی زانستی زۆر نوسراوەتەوە ، خوێندەوار و ڕۆشنبیری زۆرمان هەیە،بەلاٚم زۆربەیان متمانە و باوەڕیان بەتواناکانی خۆیان نی یە و ناتوانن ئیرادە بکەن بڕیار بدەن وهەنگاو هەڵبگرن !بۆیە لەبارێکی نائارامی و ترس و دڵە ڕاوکیٚ دا دەمێننەوە کەئەوەش بەرەو سەرلێشێواوی و بەدبەختی دەبات جا بۆرزگاربوون لەو واقیعە تاڵە لەوبارە ناهەموارەی دەرون..بۆ پێش کەوتن وبەرهەم هێنان بۆ گەشبینی وبەرچاوڕونی بۆ دڵنیایی ودوربوون لە گومان ودڵەڕاوکی بۆئازایەتی وبوێری بۆسەرکەوتن لەژیانتا بۆ گەیشتن بە هەوارگەی ئاسودەیی و بەختیاری ..بۆ دوربون لە پەژارە و خەمباری ،بامتمانە و باوەڕمان بەخودی خۆمان بەهێزبێت، گەردەتەوێت بەهێزترین کەس بیت ولەبەرانبەر کۆسپ وتەگەرەکانی ژیاندا چۆك دانەدەی ئەوەپشت بەخوا ببەستە ﴿..ومَن يتَوَكل على اللهِ فَهوَحَسبهُ﴾ هەرکەس پشت بەخوابەبەستیٚ بەسیەتی بۆکاروباری دین و دنیای، ئەوەی پشت بەخوا ئەبەستیٚ متمانە و بڕوای بەهێزە وتەسلیمی خەم و خەفەت وخەیاڵی پوچ نابیٚ کەبەوەش لەزۆرێك لەنەخۆشیە دەرونی وجەستەییەکان ڕزگاردەبیٚ {ئەوکەسەی لەخۆی دڵنیابیٚ پێویستی بە پێداهەڵگوتنی خەڵکی نابیٚ}** گۆ

## هۆیەکانی دروست کردنی متمانە لەدەرونی خەڵکانی تردا

(هەرکەسێک خێروچاکەی خەڵکی ترىلامەبەست بێ بێگومان خۆی دەگاتە بەختەوەری) ئەفلاتو

**دوای خۆت ئەبیٚ هەوڵبدەی متمانە لەکەسانی تریشدا دروست بکەی و ببی بەمامۆستای گۆڕان بەم شێوەیە :**

**1. هەوڵبدە ورە و هیمەتیان بەرزبکەیتەوە :**

**تەماشاکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێشەواعومەری فەرموو :تۆبەهەر ڕێگایەکدا بڕۆی ،شەیتان ناتوانیٚ بەو ڕێگایەدا بڕوات ( یان بە(سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) دەفەرمویٚ:تیرەکانیان جوان تێبگرە دایك و باوکم بەقوربانت بیٚ .**

**2. هەوڵبدە لایەنی لاوازیان بەهێز بکە،بڕوانە مامۆستاکەمان محمدﷺ چەندە گرنگی داوە بەوبوارە، ئەوەتاکاتیٚ (عبداللەی کوڕی مسعود )ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ بەدارخورمایەکەدا سەردەکەوت قاچەکانی دەرکەوتن هەندیٚ لەهاوەڵاٚن پێکەنین بەقاچەباریکەکانی کەخەریك بوو عبدالله تەریق ببێتەوە ،پێغەمبەرﷺ**

**ویستی ئەولایەنەی بۆپڕبکاتەوە فەرمووی:ئەوەبەقاچە باریکەکانی پێدەکەنن ، سوێند بەخوا لای خوای‌گەورە قاچەکانی لەکێوی ئوحود قورس ترن .**

3. **ئەوسیفەتەی کەچاکە و بەدڵتە لەکەسی بەرانبەردا ئاگاداری بکەرەوە لێ پێی بڵێ ئەورەوشتەی تۆم زۆر بەدڵە،وەکوپێغەمبەری خوا ﷺ بەیەکێ لەهاوەڵانی فەرمووکەناوی (ئەشج )بوو ئەی ئەشج تۆخاوەنی دووسیفەتی چاکی کەبەلای خوا وپێغەمبەرەوە خۆشەویستن ئەویش (الحِلم والإناِة )لێ بوردەیی و لەسەرخۆییە .**

4. **رێزی بەرانبەرت بگرە و شتێ مەکەپێ ی دڵگرانبێ**

5. **یارمەتی دەری بە بۆگەیشتن بەئاواتەکانی.**

6. **ماندووبونەکانی بنرخێنە و دەست خۆشی لێ بکە وەك دەستخۆشی کردنی پێغەمبەرﷺ لەودوو گەنجەی کە(ئەبوجهل )یان کوشت .**

7.. **گرنگی بدەبەچارەسەرکردنی کێشەکانیان**

8.. **هەوڵبدە کە منافەسەبکەن لەکاری چاکەدا**

9.. **فێری ئازایەتی و کاری جوانیان بکە**

10.. **هەواڵی تازە و خۆشی زوو پێ بگەیەنە**

11.. **زوو پەیوەندی پێوە بکە و لێ ی دامەبڕێ گەربە تەلەفۆنیش بێت**

12.. **بەخۆشترین ناو و نازناو بانگی بکە**

13.. **دەست پێشخەری بکە لە سەلام کردن لێیان**

14. **بەزمانی گوڵ لەگەڵیان بدوێ ،پێکەنین و ڕوی خۆش بەدەم براکەتەوە خێروچاکەیە وەك پێغەمبەرمانﷺ فەرموویەتی {ابتسامَتك في وجِهِ اخيك صدقة }(صحيح الجامع/2908)، زەردەخەنە و قسەی خۆش و ڕوی خۆش سیفەتی پێشەواکەمان بووە و کلیلی کردنەوەی دەرگای دڵەکانە ، چونکەئەوکەسەی بەهۆی پارە و دنیاوە دڵی خەڵکی ڕاگرتوە و دەوریان داوە کەپارەکە وشکایی هات ئەمانیش بلأوەی لێدەکەن و هەرناشی ناسنەو،یان گەرلەترسان مەرحەبای بکەن گەرترسەکە نەما ئاش بەتاڵی لێدەکەن ،بەلأم گەرمن و تۆی موسڵمان خۆشەویستی خۆمان و ڕێبازەکەمان بخەینە ناو دڵی بەرانبەرەکانمان بە کرداروگوفتاری جوان ،ئەوخۆشەویستیە تاسەر بەردەوام دەبێت وشتێکی کاتی نابێت .**

**{ئەوشادی یەی کە ئێمە بەخەڵکی تری دەبەخشین ،بۆخۆمان دەگەڕێتەوە ، کەواتە با بۆبەختەوەری خۆمان خەڵك شاد بکەین}** (بتهۆڤن)

## دڵەکان بەیادی خوائارام دەبن

﴿ الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد/28)

**باوەڕداران تەنها بەیادی دڵیان ئاسودەوئارام دەبێت ، یادی خوابەهەشتی سەرزەمینە،هەرکەس لێرە نەچێتەناوی ناچێتەبەهەشتی دواڕۆژیشەوە،یادی خوا ڕزگارکەری دەرونەلەشپرزەیی وماندوبون ،یادی خوا (قوت و قوەتی قەلبە) ، یادی خوا ڕێگەیەکی ئاسانە بۆهەمووسەرکەوتن وبەختەوەریەك،لەسەرەتا تا کۆتایی وەحی،ووردبەرەوە تاکوسودەکانی یادی خوات بۆدەرکەوێ ،لەگەڵ ڕۆژگارداشوێنەوارەکانی ببینەتا ببێتە شیفا ..بەیادی خوازۆرجارترس ودڵەڕاوکێ وپەشیمانی دادەمێن ..سەیرنی یەگەرئەوانەی یادی خوادەکەن بحەوێنەوەچونکەئەوە بەرەنجامی یادی خوایە،بەڵام ئەوەی سەیرەئەوەیەچۆن بێئاگایان لەیادی ئەوزاتەدەتوانن بژین(امواتُ غَيرُ اَحياء) ئەی ئەوەی شەکوای حاڵت دەکەیت و بەدەست ئازارەوە دەناڵێنی، هاوارلەخوای گەورە بکە،بەناوەجوانەکانی لێ ی بپاڕێرەوە ..چەندە زیاتریادی بکەی هێندە زیاتربەرچاوڕون دەبیت ،دڵت ئارام دەبێ،دەرونت بەختەوەردەبێ ،ویژدانت حەواوەیە،لەبەرئەوە بەیادی خوا فێری ماناکانی متمانەبەخۆبوون وپشتبەستن بەخواوگەڕانەوە بۆلای دەبین،فێردەبین گومانی باش بەرین بەرامبەری وچاوەڕوانی دەرگای خێروڕەحمەتی ئەوبین ،دیارە زیکرویادی ڕاستەقینە ئەوەیە کردەوەی لەگەڵدابێ ،نەك تەنها ڕیش وتەسبیح و قسەی ڕووت،وەك خەڵکانێك وادەزانن زیکرتەنهائەوەیەکەلەکات و ساتێکی دیاریکراودا ئەوەندەجارە بڵێ (لااله الا الله) وئیتر چی ئەکەی یان لەگەڵ کێ ئەبی قەیناکە! نا بەڵکو زیکرو یادی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لەکردارو گوفتاردا ڕەنگ بداتەوە و دوربی ولەغەیبەت و درۆوبوختان بەهەموئەندامەکانی لاشەت لەخواترس بی لەکاتی شین وشایی دا لەکاتی کڕین و فرۆشتن دا لەخۆشی و ناخۆشی داخوات لەیاد بێت و لەترسی خوا لەحەرام وغەش و فێڵ و خیاغنەت دووربکەویتەوە نەك تەنها ناوی بێ ناوەڕۆك و قسەی بێ کردەوە (ابراهیم کوڕی اسد) لەسەرەتای ژیانی دا کەسێکی دزبوو،شەوێك بۆدزی کردن چووە ماڵێك گوێ ی لەخاوەن ماڵەکە بوو لەژورەکەی ئەودیوو قورئانی دەخوێند لەوکاتەداگەیشتە ئەوئایەتە کەدەفەرمووێ: ﴿الم يانِ للذينَ امنوا ان تخشعَ قلوبهم لذكرِالله..؟﴾ واتە:ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە کەبڕواداران دڵیان گەردن کەچ بێ بۆ زیکری خوا .، یەکسەرلەوشوێنە پەشیمان بووە و تەوبەی کرد بوبە یەکێك لەپیاوچاکانی خوا ،بەئومێدی ئەوە کە ئێمەش لەخواغافڵ نەبین و لەگەڵ یادی خوادابژین .**

**( یادی خوا ئارامی یە بۆدڵەکان ،خۆشی یەبۆ دەرونەکان، بەختەوەری یەبۆکەسەکان، یادی خوا بکەتاکوخواش یادت بکات )**

## نوێژئـارامی وبەختەوەریە

**نوێژخۆراکی ڕوحە وبەهێزی دەکات بەرانبەر بەلأو ناڕەحەتیەکان، بەنوێژکردن دلْ ئارام وبەختەوەردەبیْ، کاتیْ نوێژەکەی دادەبەستیْ ودەڵیْ(الله اکبر)وخوالەهەمووشتیْ بەگەورە تردەزانیْ وئیترلەهیچ شتیْ ناترسیْ بەوەش هەست بەئارامی وحەوانەوە دەکات،بەنوێژەکەی ئاوپرژێنی دلْ ودەرونی دەکات.ئەی ئەو کەسەی بەختەوەریت دەویْ ڕونا کی چاوانت دەویْ،بەدلْ وگیان نوێژەکانت ئەنجام بدە،ئەوکاتە هەست دەکەی ئاسودەوبەختەوەری،خۆئەگەرواشت نەکرد ئەوە تەنها لۆمەی خۆت بکە،وەك شاعیر دەڵیْ :**

َترجوا النَجاة ولم تَسلك مَسالِكَها....إنَ السفينة لا تجرى على اليَبَسِ

**بەتەمای ڕزگاری وبەختەوەریت وئەورێگەیەشت نەگرتووە ..کەشتی لەوشکایی ناڕوات وهەرماندوبونت بۆ دەمێنێتەوە !،پێغەمبەر ﷺ هەرکاتیْ توشی بەلأوناخۆشییەك بوایە هانای بۆ نوێژ دەبرد وبانگی بیلالی دەکرد دەیفەرموو:** (اقم الصلاة یا بیلال ارحنابها) (اخرجه احمد وابوداود)**، زانایەکی خواناس کاتیْ کەدوژمنەکانی ئازاریان دەدا لەزیندانا فەرمووی :چیتان لێم دەویْ ؟من بەهەشتی خۆم لەناوسنگدایە، بەدەستی ئێوەدەرنایە ،بەندیخانەم خەڵوەتە،دەربەدەریم سەیران وسیاحەتە، کوشتنیشم پلەی بەرزی شەهادەتە !***

**وەهەروەهادەڵێت:ئەگەرپاشاکان بیانزانیایە ئێمەی موسڵمان دڵمان چەندخۆشە بەزەبری شمشێرلێیان دەسەندین گەربیان توانیایە ،(ابن تیمیه )کاتیْ خستیانە زیندانەوە بیْ تاقەت و خەمبارنەبوو !کە لێیان پرسی ووتی :**

* العوائق/محمد احمد .

**زیندانی کەسێکەدڵی بەندکراو بێت لەیادی خوا ،ئەسیریش کەسێکە کۆت و بەندی هەواوئارەزوی بێت (ابوبکری وراق )وتویەتی:ئەگەر هەوا و ئارەزوو زالْ بوو بەسەر دڵی مرۆڤدا دڵی تاریك دەبێت،ئەگەردڵیش تاریك بووهەست بەناڕەحەتی دەرونی دەکات و بەردەوام ئەو دڵە تەنگە،ئەوکاتە ڕەوشتیشی ناشیرین دەکات و بەهۆیەوە خۆیشی بێزار دەبێت و خەڵکیش ڕقیان لێدەبێتەوە .ئەوە فەزلْ و گەورەیی نوێژە بەگشتی ،بێگومان ڕەنگدانەوەو کاریگەری شەونوێژ زیاترە لەسەر بەختەوەری و ئاسودەیی دەرونی بڕوادار .خێزانی چاك شەوگاردابەش دەکەن بۆشەونوێژ و عیبادەت (عەتای کوڕی ڕەباح )لەگەلْ خێزانەکەی شەوگاریان بەشکردبوو بۆ عیبادەت و کۆتایی شەویان بۆ خەسوەکەی دانابووکەبەشەچاکەکەیە !( نەك دژایەتی بوك و خەسوی ئەمڕۆ) کەخەسوەکەی مردئەوجا شەویان کردبەدووبەشەوە،کەژنەکەش مرد (عەتا) شەوتابەیانی**

عیبادەتی دەکرد و دەیگوت بایادی خوالەماڵەکانمان نەبڕیٚ بەڕاستی ئەم ماڵانە دەزانن بەختەوەری چی یە؟ جێگای سەرسوڕمانە ماڵەکانی ئێمەوەکو ڕۆژئاوای لێهاتووە،ژورێك بۆ ئارایشت و ژورێك بۆ دانیشتن و یەکیان بۆ ڕابواردنی خێزان و ژورێك بۆ نان خواردن ونوستن و میوانی و پێشوازی و ...،ئەی کوا ژوری نوێژلەوماڵەگەورەیەدا ؟ئەگەرعومەرو ابوبکر سەردانمان بکەن نامان ناسنەوە و دەڵێن :ئەمانە نەوەی ئێمەنین !!کەواتەئەوماڵەی شەونوێژی تێدایە بەختەوەرترین ماڵە،کەتیایدا بیردەکەنەوە لەم گەردونە..لەم یاسای ژیان و بوونە ..لەم مردنە، چاوەك دانیشتوانی سەرزەوی ئەستێران لە ئاسۆەبەدی دەکەن ،فریشتەکانی ئاسمانیش ئەوماڵانەلەسەرزەوی دەبینن کەیادی خوایان تێدادەکرێتەوە و بەڕوناکی درەوشاوەن .شەونوێژ خوێن کاتیٚ نەخۆش ئەکەویٚیان گرفتێکی بۆ دروست دەبیٚ ،فریشتەکان هەواڵی دەپرسن،کوا افلانەکەس ئەمرۆ کارەکەی بەرەوئاسمان نەهات وەرمان نەگرتوە وەك ڕۆژانی تر ،کەدەڵێن گرفتێکی هەیە یان کێشەیەك، فریشتەکان بۆی لەخوا دەپاڕێنەوە کەرزگاری بکات ،چونکە ئەوانیش جگە لەکارەکەی خۆیان داوای لێخۆش بوونیش بۆ شەوبێداران دەکەن ،بەلاٚم نەك بۆ کەسانی تیا ترۆخانە و گۆرانی و کلیپ و سینەما و بەڕەڵلاٚیی بەداخەوە کەهەندیٚ لە موسڵمانان بۆ نوێژە فەرزەکانیش ئامادەنین یان هەر لەکۆڵیٚ خۆی دەکاتەوە چێژ لەئیمانەکەی وەرناگریٚ ودەرونی ماندوو هیلاکە بەدونیاوە و لەئارامی دورە کەسەرئەنجام بەختەوەر و دامەزراو نابن .

## نوێژ

| | |
|---|---|
| نوێژە بناغەی کۆڵەکەی دینە | نوێژە سەرمایەی بەختیاری ژینە |
| نوێژە دەرمانی دەردی ئینسانە | سارێژ کەرەوەی گشت برینانە |
| نوێژە ڕوناکی و چرای ناوگۆرە | لابەری ترس و شین و شە پۆرە |
| نوێژە ئارامی ئەبەخشیٚ بەژیان | هۆی تورەبوونەهەردەم بۆشەیتان |
| نوێژ تکاکارە لەرۆژی مەحشەر | لەناو جەهەنەم ئەتهێنێتە دەر |
| هەرکەس نوێژی کردبەراستی وجوانی | بەهەشت ئەکریٚ زۆر بەئاسانی |

## داوای لێخۆشبون ( اســتغفار )

( بەرنادشۆ )کەزانایەکی هۆڵەندیە دەڵیٚ:ئەگەر محمد لەناومان بایە ئێستا هەموو کێشەکانی جیهانی لەماوەی قاوە خواردنەوەیەکدا بۆ چارەسەر دەکردین .( سُبحانَ اللہ ) هۆیەکانی بەختەوەری لەبەردەستمان

**دان بەلاَم بەكاريان ناهێنين ،ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی:** (مَن اكثر من الاستغفارجعل اللهُ مِن كل هَمٍ فَرَجا،ومن كلِ ضيق مخرجا،ويَرزقه من حيث لايحتسب) **واتە:هەركەسێ زۆر تۆبەو ئيستغفار بكات خوا لە هەموو خەفەتێك ڕزگاری دەكات ،وەلەكاتی نارەحەتی دا دەروی لێدەكاتەوە ، وەرزق و ڕۆزی دەداتێ بەشێوەيەك كە ئەو هەستی پیێ ناكات ،سەيرە بەخەڵكی غەمبار دەڵێن :گوێ لەگۆرانی بگرە خەمەكانت نامێنێ !بەلاَم خەمبار تر دەبێت ونيفاق لەدڵيا ئەڕوێنێ ،سەيرە لە ڕۆژانی هەينی دەچێ بۆ گەشت و گوزار وەك چاو لێكەری ئەو خەڵكە بەلاَم كە گەڕايەوە لەجياتی خۆشی زۆر هيلاك و شەكەتە ، چونكە لەو ڕۆژە پيرۆزەدا بێ فەرمانی خوای كردووە ،يان جگەرە دەكێشن وەك خەم ڕەوێنێك كە لە ڕاستی دا خەمەو خەم ڕوێنە !يان دەڵێ بۆيە ئارەق دەخۆمەوە تاساتێ لەخەمەكانم دابڕێم وبەختەوەر بم !بەلاَم نازانێ كەئەمانە هەمويان سەرچاوەی خەم و بەدبەختين ،خەموكێشەو گرفتت بۆ زياد دەكەن لەڕوی دەرونی و جەستەييەوە كەئەوەش شتێكی ديارو بەرچاوە لای خەڵكی ژير ئەی ئەو كەسەی كە عەوداڵی خۆشی و شادی و بەشوێن بەختەوەريدا دەگەڕێ ی ،بزانە كەبەختەوەری ڕاستەقينە لەپەيڕەو كردنی فەرمانەكانی خوادايە،پياوێك چووە خزمەت ئيمامی عەلی :گوتی لەناوچەكەمان باران نابارێ ؟ فەرمووی :زۆر ئيستغفار بكەن كابرايەكی تريش پیێ ی گوت هەژارو دەست كورتم ؟ فەرمووی :زۆر ئيستغفار بكە ،يەكێكی تريش پرسياری لێكرد دەمەوێ كوڕم ببێ ،پیێ ی فەرموو زۆر ئيستغفار بكە .گوتيان ئەی گەورەی موسڵمانان بۆ هەموو پرسيارەكان هەريەك وەلاَمت دانەوە ، ئەويش فەرمووی مەگەر خوا نەی فەرمووە :**﴿..اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراًيُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَاراً ﴾ **واتە تەوبەو**(استغفرالله﴾ **بكەن بارانتان بەلێزمە بۆ دەبارێت ماڵ و سامان و نەوەتان پیێ دەبەخشێ،(هاوشێوەی ئەمەلەحەسەنی بەصری گێڕدراوەتەوە) .بێ حيكمەت نەبووە كە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ ئەم ويردەی ڕۆژانە حەفتا يان سەدجار دوبارە كردۆتەوە فەرمويەتی**{يأيها الناس توبوا الى الله واستغفره فاني أتوب في اليوم مائة مرة} **مسلم .واتە :ئەی خەڵكينە تۆبە بكەن و داوای لێخۆش بوون بكەن وە من ڕۆژی حەفتا جار (استغفر الله) ئەكەم ، لە گێڕانەوەيەكی تردا سەدجار .ئەمە لەكاتێك دا وای كردوە كە خوای پەروەردگار لە پێغەمبەر خۆش بووە ، بەلاَم بۆئەوەی بيسەلمێنێ كە بەندەيەكی وەفادار و سوپاسگوزارە، ديارە داواكردنيش تەنها بەقسەی ڕوت نابێ ،بەڵكو هەرشتێ داوابكەی ئەبێ بەكردەوە هەوڵيشی بۆبدەی وەك: پەشيمان بوونەوە لەگوناهەكانی ڕابردوو، دوركەوتنەوە لەخراپەكاری وتاوان، چونكەئەوكەسەی بەزمان دەڵێ (استغفر الله) بەلاَم بەكردەوە نايكات وەك گاڵتەی پیێ بكات وايە،جا ئەگەربەڕاستی داوامان لەخوا كردو زۆر ئيستغفارمان كرد شادی و بەختەوەری مان خستە دڵی دەورو بەرمان ئەوە خواش بەختەوەری دەخاتە ناومان ، كەواتە چۆن بەختەوەر دەبم ؟ بێگومان بە لەخواترسان ،بەپابەند بوونمان بە فەرمانەكانی خواو پێغەمبەرەكەی ساخوايە دڵخۆش و بەختەوەرمان بكەی ..پايەدارو مايەداربين لەدنياو قيامەت دا..ئامين.**

## ئەوەی ڕۆیشت ڕابردووە لەدەست چووە

پێشینان ووتویانە: (لەدووچوان مەچوو) لەیادت بێت ڕابردوو تەنها ئەزمونە ،بەلاّم ژیان لەگەڵیدا وخەم خواردن بۆی شێتی یە وبکوژی ئیرادە و لەناوبەری ژیانی ئێستایە..دۆسی یەی ڕابردوو لای ژیرەکان داخراوە و تەنها بۆ کاری زۆر پێویست نەبێت ناکرێتەوە ..بەهەموو ئەوشتانەی کەتیایەتی لەئەرشیفدا هەڵگیراوە،ئەوەی خراپت کردووە خەم و خەفەت بۆی تازە چاکی ناکاتەوە،ئەوەش کەباشت کردووەتازە ڕۆیشت و ناگەڕێتەوە بەڵکوتەنها دەتوانی وەك ئەزمون سودی لێ وەرگری ،لە ڕابردوودامەژی :

ئایادەتەوێ ئاوی ڕووباربۆ دواوە بگەڕێتەوە؟

یان دەتەوێ خۆر بۆ خۆرهەلاّت بگێڕیتەوە؟

یان منداڵ بۆناوسکی دایکی بگەڕێتەوە ؟

یان فرمێسك بۆناو چاوەکان بگەڕێتەوە؟

دیارە ئەمانە مەحاڵن بۆیەباشتر وایەخۆتیان پێوەسەرقاڵ نەکەی چونکە بەخەم خواردن بۆ ڕابردوو و ژیان دەبێتە ژان ..ڕابردوو کەڕۆی ناگەڕێتەوە ...خەم و یادگاری نایهێنێتەوە خەمی ڕابردوو کات کوشتنە، لەناوبردنی تواناکانە خوای گەورە لەباسی گەلانی پێشوماندا دەفەرموێ: (تلكَ اُمة قدخَلت.. ).ڕۆڵیان کۆتایی پێ هات ،پێویست ناکات ئێمە لاشەی زەمان تاوتوێ بکەین ،پێویستیش ناکات ڕەوڕەوەی مێژوو بگێڕینەوە ،ئەوەی کەدەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو وەك ئەوە وایە کەئارد بهاڕێ لەکاتێکدا کەئەوپێشترهاڕدراوە وەهەرلەکۆنە بەوکەسانەیان وتووە کەبۆ رابردوو دەگرین :مردوو لەگۆڕەکەی نایەتە دەرەوە ..!کێشەکەش لەوەدایە بەرامبەر ئێستەمان دەسەوسانین و خۆمان سەرقاڵکردووە بەڕابردوە وە ،کۆشکەجوانەکانمان لەیاد دەکەین و خەم بۆ خێمە وخانوە قوڕەکانمان دەخۆین ..!خەڵك سەیری دواوە ناکەن وەئاوڕ بۆ دواوە نادەنەوە ،لەبەر ئەوەی با بەرەو پێش دەڕوات،ئاویش بەردەوام بەرەوپێش مل دەنێ ،قافڵەش هەربۆپێشەوە دەڕوا،بۆیەهەرگیزپێچەوانەی ڕێڕەو سوننەتەکانی ژیان مەجوڵێرەوە..جابۆئەوەی لەژیاندا هەمیشەبەرەوپێش هەنگاو بنێی ،ئامۆژگاریت دەکەم پردەکانی پاشگەزبونەوە بڕوخێنی

**ڕووله ڕووگه پشت له تاوان          بۆسەربەرزی هەردوو جیهان**

# تەنها بۆ ئەمڕۆ ئەژیم

**لەوشتانەی کەبەسودوکەڵکەبۆژیانی مرۆڤ یەکلایی کردنەوەو ئەنجامدانی کاری ڕۆژانەیەتی،بۆئەوەی کارەکانی دوێنێ وئەمڕۆی کەڵەکەنەبن بەسەریەوە وبێزاروخەمبارنەبی،کاری ڕۆژانەت ڕاپەڕێنە،وەك وتراوە:کاری ئەمڕۆمەخەرە سبەینێ،(ئیشی بەوەختی پاشای سەرتەختی) چونکە دوێنێ ڕابردووبەیانیش ملکی تۆنییەونادیارە کەواتە:**

**گەربەیانیت لێ هات بەتەمای ئێوارە مەبە،وابزانە تەنها ئەمڕۆ دەژیت بۆیە بڵێ**

**بۆئەمڕۆزمانم پاك ڕادەگرم ناهێڵم قسەی خراپی لێ بێتەدەر**

**بۆئەمڕۆ نوسینگە وماڵەکەم ڕێك و جوان دەکەم**

**بۆ ئەمڕۆ گرنگی دەدەم بەیاساکانی ڕێکوپێکی لاشەو پاکوخاوێن ڕای دەگرم**

**بۆئەمڕۆگرنگی دەدەم بەڕوکاری خۆم وئاگام لە جوڵە وهەنگاوەکانم دەبێ.**

**بۆ ئەمڕۆ دەژیم و خۆم ماندوو دەکەم لەپەرستشی خوای خۆمدا ، نوێژەکانم بەجوانترین شێوە ئەنجام دەدەم، سوننەتەکانیش جێبەجێ دەکەم،بەردەوام دەبم لە قورئان خوێندن وموصحەفەکەم دەکەمە هاوڕێی خۆم**

**بۆ ئەمڕۆ سەیری کتێبخانەکەم دەکەم و نوسراوێکی بەسود دەخوێنمەوە**

**بۆ ئەمڕۆ دەژیم و گەورەیی لەدڵمدا دەچێنم و داری بوغز و کینە وشەڕ بەڕەگەکانی یەوە هەڵدەکێشم لە خۆبەگەورەزانی خۆ دەرخستن و لەخۆبایی بوون و حەسودی وگومانی خراپە...هتد.**

**بۆ ئەمڕۆدەژیم و سود بەدەوروبەرم دەگەیەنم، سەردانی نەخۆشێك دەکەم ،لەگەڵ جەنازەیەکدا دەڕۆم ،برسی یەك تێر دەکەم ،نارەحەتی لەسەر کەسێك لادەبەم ، داوای گێڕانەوەی حەقی لاوازێك دەکەم ،ڕێز لەزانایەك دەگرم ،ڕەحم بەبچوکێك دەکەم ،ڕێز لەگەورەیەك دەگرم ،ئەمڕۆڕۆژتە وئەمە جوانترین دەستەواژەی بەختەوەری یە بۆکەسێك کەبیەویت ژیان لەخۆشی دابیبنێ.**

## ڕازی بەبەو بەشەی کەخوا پێی داوی .... هەردەوڵەمەندی هەتاکو ماوی

پێویستە قەناعەتت هەبێ بەوەی کەهەتە لەلاشەو سامان ماڵ و منداڵ و توانا ،ئەمەش یاسایی قورئانە (فخذ ما اتيتك وكن من الشاكرين) زۆرێك لە زانايانی سەلەف وجيلی يەكەم ،خاوەنی پارەو سامانێكی زۆر نەبون و ماڵ و باڵەخانەشيان نەبووە ،بەڵام لەگەڵ ئەوەشداكاريگەريەكی گەورەيان لەسەر ژيان هەبوەو بونەتە مايەی بەختەوەری بۆ خۆيان و بۆ خەڵكيش ،لەبەرئەوەی زانيويانە ئەوەی خوا پێی بەخشيون بەكاری بهێنن لەشوێنی خۆيدا ،خوای گەورەش بەرەكەتی خستۆتە تەمەن و كات و تواناكانيانەوە .. هەندێك دەبينی بڕوانامەی زۆر بەرزی جيهانيان بەدەست هێناوە بەڵام پێدەچێ كۆمەڵێكی كەم لە خەڵكی سودی لێ وەرگرن ،بەپێچەوانەشەوە كەسانێكی تر كەبڕوانامەی ئاسای يان هەيە بەڵام وەك ڕوبار خۆيان كردوٚتەوە بۆ خزمەتی مرۆڤايەتی، ئەگەر دەتەوێ بەختەوەر بی ڕازی بە بەو وێنەيەی كەخوای گەورە بۆی كێشاوی ،ڕازی بە بەباری خێزانيت ، بەدەنگت ،بەئاستی تێگەيشتنت ،بەداهاتت، بەكورتی ڕازی بە بەژيانی خۆت وبەراوردی مەكەلەگەڵ خەڵكی تردا تەنها مەگەر بۆ سود وەرگرتن و ئەزمون نەبێ. ڕازی بە بەوەی خوا بۆی نوسيوی دەبيتە دەوڵەمەنترين كەس، ئەوكات چاوت لەماڵی خەڵكی نابڕی ،بەدەستكەوتەكانيان خەمبار نابی و بگرە دوعای خێريشيان بۆ دەكەی بەمجۆرەش بەختەوەری هەردو جيهانت مسۆگەرە،چونكە قەناعەت دەوڵەمەنييەوگەنجينەيەكی نەبڕاوەيە. **دەوڵەمەندی مرۆڤ بەدڵە نەك ماڵ گەورەيی مەردوم بەعەقڵەنەك ساڵ بەبێ قەناعەت بژی هەزار ساڵ بەسەر ئارەزوی خۆتدا نابی زاڵ**

## چۆن قەناعەت لەخۆماندا دروست بكەين

دوای ئەوەی گرنگی قەناعەت وڕازی بوون بەبەشی خۆت زانی، پێويستە ئاماژەبكەين بەوخاڵانەی كەدەبنەهۆی دروست بونی قەناعەت :

1) بونی بيروباوەڕێكی پتەودامەزراو: بۆئەوەی قەناعەت لەدەرونماندا دروست ببێت پێويستە ئيمان وباوەڕێكی پتەودامەزراولەناخماندا بچەسپێت،چونكەباوەڕبە(مبدا) دەبێتەمايەی دامەزراوی مرۆڤ قوڵ بونەوەی گيانی متمانەبەخۆبون.

2)يەكبونی كرداروگوفتار: يەكێكی ترلەهۆكارەكانی دروست بونی قەناعەت يەكبونی كرداروگوفتاری مرۆڤە،بەومانايەی كەقسەكانی لەهەڵسوكەوتی ڕۆژانەيدا ڕەنگ بداتەوە ،وەخوای گەورەش لەوكەسانە تورەيەكەكرداروگوفتاريان جياوازە،وەك فەرمويەتی: ﴿ياايهاالذين امنوالمَ تقولونَ مالاتفعلون،كبرمقتا عندالله ان تقولوامالاتفعلون ﴾ (الصف) واتە:ئەی ئەوانەی كەباوەڕتان هێناوە بۆچی ئەوەی دەيڵێن ئەنجامی نادەن،بۆچی كرداروگوفتارتان پێچەوانەيە؟!بەڕاستی خەشم وڕقێكی گەورەيەلای خوابەوەی كەدەيڵێن ونايكەن .

3) دياری كردنی هەدەف وئامانج : دياری كردنی ئامانجەكان لەژيانداهۆكارێكی گرنگن بۆچەسپاندن وجێگربونی قەناعەت لەمرۆڤدا. ئامانجەكانيش لەژياندا زۆرن هەندێكی دنيای يەوهەندێكی قيامەتی

**یەلەدواڕۆژدایە،خوای گەورە فەرمویەتی:**﴿وابتغِ فیمااتاك الله الدار الاخرة ولاتنسَ نصیبكَ من الدنیا...﴾(القصص/77) **واتە:هەوڵ بدە بەوتواناو لێهاتویی وئەوماڵ وسامانەی کەخواپێی بەخشیوی ماڵی قیامەت وبەهەشتی بەرینی پێ بەدەست بێنێ،بەشی خۆشت لەدونیادا بەحەلاڵی فەرامۆش نەکەیت ،چاکەبکەوەکوچۆن خوای گەورەچاکەی لەگەڵداکردووی .پێشەواعەلی دەفەرموێ:**

اِعمَل لدنیاكَ کأنك تعیش ابداً            واعمل لاخرتك كانك تموت غداً

**واتە:کاربکەبۆدونیاوبەدەست هێنانی شتی بەسوود تیایدا وەکوئەوەی کەبەردەوام تیایدا بمێنیتەوە،وەکاربکەوهەوڵ بدەبۆقیامەت ودواڕۆژت وەکو ئەوەی بەیانی دەمری.**

4) **بڕیارنەدانی پەلە: سروشتی مرۆڤ وایەحەزبە بڕیاردانی پەلەوسەرپێی دەکات،بەلاّم خۆڕاگری ودان بەخۆداگرتن لەوکاتانەی کەپێویستی بەهەڵوێست وبڕیارە قەناعەتی مرۆڤ بەهێزدەکات و وای لێ دەکات کەهەست بکات بەوەی کەدەتوانێ خاوەنی بڕیاری خۆی بێت وەلەهەمان کاتدا جڵەوگیری نەفسی خۆیشی بکات قورئانیش لەسورەتی حجرات ئایەتی (6)فێرمان دەکات لەوکاتەی کەهەواڵێکمان بۆدەهێنن بڕیاری سەرپێی وڕاستەوخۆی لەبارەوە نەدەین بەڵکو ڕوونی بکەینەوە لێی بکۆڵینەوە بزانین ئایا ئەوهەواڵ ودەنگوباسە ڕاستە یان نا.**

5) **پشت بەخۆبەستن وچاوەڕوانی نەکردن لەخەڵك: ئەمەش هۆکارێکی گرنگی دروست بوونی قەناعەتەلەناخ ودەروندا مرۆڤ چاوەڕوانی خەڵکی نەکات کەبەرەوپێشەوەی بەرن وبیگەیەنن بەئامانجەکانی بەڵکوهەردەم پشت بەخۆی ببەستێت وهەوڵ بدات لەسەر پێی خۆی بوەستێ .**

6) **ئامادەبونی پێش وەختەبۆ ئەنجامدانی هەرکارێك: ئامادەبونی پێش وەختەو گرتنەبەری هۆکارەکان بۆئەنجامدانی کارەکان هۆکارێکی زۆر گرنگەبۆدروست بونی قەناعەت لای مرۆڤ .پێغەمبەری ئازیزیش(د.خ) دەفەرموێ :**(ان الله یحب اذا عمل احدکم عملاً ان یتقنه).**واتە:بێگومان خوای گەورە پێی خۆشەکاتێك کەسێك لەئێوە کارێك دەکات،وردەکاری تێدابکات وبەجوانی ئەنجامی بدات .لەقورئان وفەرمودەدا خۆئامادەکردنی پێش وەختە شتێکی داواکراوە.ئەوەتا لەوکاتەی پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺپرسیاری لێ کردلەبارەی قیامەت ـ وتی:یارسول الله متی الساعه؟کەی قیامەت دێ پێغەمبەری خواﷺ فەرموی :ما اعد دت لها ـ چیت بۆ ئامادە کردووە .واتە:ئایا پێش وەختە خۆت بۆئامادە کردووە.**

7)**باوەڕبوون بەوتواناولێهاتوویانەی کەلەناخت دایە: باوەڕبونی مرۆڤ بەتواناو لێهاتوی یەکانی خۆی هۆکارێکی گرنگە بۆجێگیربوونی قەناعەت لەناخ و دەروندا.**

8)**بۆ دنیا سەیری خوارخۆت بکە: چاکترین شت بۆدروست بوونی قەناعەت وڕازی بوون بەبەشی خۆت ، بۆئارامی و دڵ و دەرون و سەیرکردن و ڕوانینەبۆخوارخۆت لەشتی دونیادا ،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی :**

{انظروا الى من هو اسفلَ منكم ولاتنظروا الى من هوَفَوقَكم فانه اجدران لاتزدروا نعمة الله عليكم} (رواه مسلم)
واته:سەيرى ئەوكەسەبكەن كەلەخوارخۆتەوەيە،چاولەوانە مەكەن كەلەسەروى خۆتانەوەن چون ئەوە باشترەبۆئەوەى هەست بە نيعمەتەكانى خوابكەيت ولەبەرچاوت بن و هى خۆت بەكەم نەزانى . مرۆڤ گەر بەوشێوەيە بيركاتەوە ئەوەهەست دەكات كەلەزۆربەى خەڵكى باشترە وبۆنموونە:دەڵێ :شكور لەشم ساغە،خۆكرێچى نيم ،چا نى يە قەرزدارنيم ،چاك نى يە ديل نيم ...، بێگومان لەتۆش خراپتر هەيە، بەم كارە خەمەكانى دەرەونەوە و دڵى ئاسودە دەبێت ،واتە سوپاسگوزارى نيعمەتەكانى خوادەكات ، بەلاّم گەر بە پێچەوانەى ئەوە بيركاتەوە و سەيرى سەروى خۆى بكات ، ئەوە هيلاك و ماندوو دەبێت وخەم و خەفەتى بۆ زياد دەبێ بەبەلاش و لەوانەيە نەگات بەومەبەستەش . ئەوەى ئێستا دەبينرێ لە ململانێ ى دنياوچاولێكەرى كوێرانە بۆمۆديلى بێگانە ، تەنها كۆشك و تەلارەكانى بەرزكردۆتەوە و لەبەرانبەردا بەوئەندازەيە حەياوحورمەت و ڕاستى وچاكى و پاكى دابەزيوە، گەندەڵى وخيانەت ولاّتى تەنيوە ، چونكە هەموو شتەكان لەڕوى بەرژەوەنديە ماددييەكەوە سەيردەكرێ و بەوەش خەمەكان زياد دەكەن قەناعەت و ئارامى دەرون كەم دەبێت ، بەلاّم بۆ تەقواو ديندارى پێويستە چاولەسەروى خۆمان بكەين ، چونكەماوەى دنيالەچاوقيامەت (قەترە بە دەريايە) دەبێ هەريەكەيان بەئەندازەى مانەوە تيايدا هەوڵى بۆبدەين .

## قەناعەت گەنجينەيەكى نەبڕاوەيە
## هـــــەركەس بيبيێت حـەساوەيە

## داد پەروەرو ميان ڕەوو بە

دادپەروەرى داوايەكى شەرعى و عەقڵى يە ،نەزيادە ڕەوى و نەكەمتەرخەمى ،هەڵكشان وداكشان وتوند ڕەوى ڕێگەپێنەدراوە،بەڵكو حەق ڕەوى وميان ڕەوى دروست و گونجاوە ڕێگە پێدراوە، هەركەس بەختەوەرى دەوێ پێويستە لايەنى سۆزدارى خۆى ڕێك بخات ،پێويستە دادپەروەر بێ لەكاتى ڕازى بوون و توڕەبون وخۆشى وناخۆشى دا ، چونكە زيادەڕەوى لەمامەڵەكردنت لەگەڵ ڕوداوەكاندا ستەمە لەدەرونى

خۆت ،میان ڕەوی زۆر باشە ،لەبەرئەوەی شەرع لەسەر هاوسەنگی دابەزیوە و بونەوەریش هەر لەسەر ئەو هاوسەنگی یە وەستاوە ، ماندو ترین کەس ئەوکەسەیە کەخۆی داوەتە دەست حەزو ئارەزوەکانی ، شتەکانی لەلا گەورە دەبیٚ وادەزانیٚ هەموو دنیا لە دژی ئەو پیلان دەگێڕیٚ ،هەمیشە لەخەم وخەیاڵدا دەژی ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگریٚ کەمرۆڤ زادەی بیر کردنەوەکانیەتی ،کاتێك بەزیادەڕەوی بیر دەکاتەوە لایەنی سۆزداری زاڵ دەبیٚ بەسەر ژیری دا ئەودەرەنجامەی لیٚ دەکەوێتەوە لەگەڵ دڵتا دابنیشە بیر بکەرەوە زۆرێك لەوانەی لێی دەترسین ڕونادات ،ئەگەر ڕوش بدات تۆ پێش تر خۆتی بۆ ئامادە بکە ،ئەوپەڕی حاڵەتی خراپ بێنە پێش چاوت وپاشان چارەسەری بۆ دابنیٚ ،ئیتر پێویست ناکات تۆ پێش ڕودانی شتەکە خۆت سەرقاڵ بکەی پێیەوە ،چونکە ئەوە دەرونت دەشێوێنیٚ ،مامەڵە لەگەڵ ئەمرۆدا بکە نەك دوێنیٚ کەڕۆیشت یان سبەینیٚ کە نەهاتووە، ئەی کەسی ژیر هەموو شتێك حەقی خۆی بدەریٚ ، شتەکان لەسەر خۆت گەورە مەکە ،دادپەروەر بە ،میانڕەوبە بیٚ زیادوکەم.

## چاکەکردن لەگەڵ دەورو بەردا

یەکەم سودمەند لەدڵخۆش کردنی خەڵکی ئەوانەن کە هەستاون بەدڵخۆش کردنەکە ،زوو بە زوو بەروبومەکەی دەچننەوە لەدەرون و ڕەوشت و ویژدانیاندا ،سنگیان فراوان دەبێت و دەکرێتەوە ،ئارامی هێمنی باڵ دەکێشیٚ بەسەریاندا ..بۆیە هەرکات خەم و ناخۆشیەك ڕووی تیٚ کردی هاوکاری یەکێك بکەو دڵی کەسێك خۆش بکە ،هەست بەخۆشی و ڕەوانەوەی خەمەکەت دەکەی ،چاکەکردن بۆباوەڕدارو بێباوەڕ بەسودە، بەڵام باوەڕدارپشکی شێری بەردەکەوی چونکەباوەڕدارلەبەرخوا لەدڵەوە بەئومێدی پاداشتی دواڕۆژچاکەئەکات بەوەش ئارامی وخۆشی ئەگاتە دڵی،بەڵام بێبڕوایان کارەکانیان زیاتر ڕوپامایی وقسەی لوسە ورەنگ دانەوەی باشی نابیٚ لەسەردڵیان چونکە نیفاق ودووڕوییە،دیارە چی بچێنی ئەوەئەدوریتەوە وچاکەچاکەی لەدوایە ،بۆدنیا ئارامی دڵ و دەرونی تێدایە،بۆدواڕۆژیش توێشووپاداشت وڕازی بوونی خوایە، کاری چاك وەك میسك وایە سود بەهەڵگروو فرۆشیارو کڕیاریش دەگەیەنێیٚ ، بەخشینی بزەو خەندەیەك بەڕوی کەسێکدا خێرێکی گەورەیە(ولو ان تلقی اخاكَ بوجهِ طَلیق).ڕووگرژیش ڕاگەیاندنی جەنگێکە بەرامبەر مرۆڤەکانی دەوروبەرت،مشتیٚ ئاو بۆ سەگێك دەبێتە هۆی چونە بەهەشتی کەسێك ، لەبەرئەوەی خاوەنی پاداشت بەخشەرو جوانە ، جوانیشی خۆش دەویٚ ، دەوڵەمەندی سوپاس گوزارە،ئەی ئەوانەی کەخۆتان بە بەدبەخت دەزانن وەرن بۆ باخچەی بەختەوەری و خۆشی و سەرقاڵی خێر بن هاوکارو میواندار وپاڵپشت وخزمەتگوزاری خەڵکی بن،ئەوکات تام و بۆنی بەختەوەری دەچێژن.

## کاتەکانت بەکارپڕبکەرەوە

بەتاڵەکان لەژێندا ئەهلی غەیبەت و بڵاوکردنەوەی شائیعاتن ،لەخەتەرناکترین حاڵەتەکانی بیر ئەوڕۆژەیە

کەبێ کار دەبێت و وەك ئوتومبێلێکی خێرای بێ شۆفێری لێ دێت کەئەملاولا دەکات .. هەر ڕۆژێك بێکار بویت خۆت ئامادە بکە بۆخەم و خەفەت ،لەبەرئەوەی ئەم دەستبەتاڵی یە سەرجەم دۆسیەکانی ڕابردو وئێستەو داهاتووت بۆ دەکاتەوە ،دەتخاتە حاڵەتێکی پڕ وەهم و خەیاڵەوە ،بۆیە ئامۆژگاریم بۆ خۆم و تۆش ئەوەیە کەخۆمان سەرقاڵ بکەین بەکاری بەسودەوە ،چونکە بێکاری بکوژێکی بێدەنگی کات و تەمەنی تۆیە .. حەوانەوەی بەردەوام بێئاگایی یە ،دەستبەتاڵ دزێکی لێهاتووە ،ژیریش نێچیرێکی لەبەر یەك هەڵوەشاوەی ئەم جەنگە وەهمی یەیە.. کەواتە ئێستە هەستەو نوێژ بکەو بخوێنەرەوە ،بنوسەو بیر بکەرەوە ،کتێبخانەکەت ڕێك بکە ،کەموو کوڕی ماڵەکەت چاك بکە ،یان سود بەخەڵکی بگەێنەتاکو ئەو کاتە بەتاڵە پڕ بکەیتەوە ..بەچەقۆی کار ملی بێکاری ببڕە ،ئەوکات پزیشکانی جیهان زەمانەتی لە50 ٪ی بەختەوەریت بۆ دەکەن ،سەیری جوتیارو کرێکارو نانەوا بکە وەك بولبول گۆرانی بەختەوەری وئارامی دەچڕن ،تۆش لەسەر جێگەکەت فرمێسکەکانت دەسڕی و وەك کەسی مارانگەستە پەشۆکاوی .

ئیش کردن بۆلەش دەرمانی دەردە بەدەنی کاسب وەك پۆڵاو بەردە هەرکەس بێکارە موبتەلای دەردە
زۆربەیان ڕەنگ وڕوخساریان زەردە

## شـــتی بچوك بەکەم مـــەزانە

تاوانەبچوکەکان گەر زۆربون وکەڵەکەبوون گەورە دەبن،ئاگری دەنکە شقارتەیەك چەندە بچوکەبەڵام دەبێتەسوتانی ناوچەیەکی بەرفراوان ، زۆرجارلەشتی بچوك وبێ نرخەوە شتانی گەورەوترسناك دروست بوون، سەیرکەپێغەمبەری خوا(ﷺ)لەفەرموودەیەکی دا دەفەرموێت:(هەندێ کردەوەی خراپی بێ نرخ هەیەکە ئێوە حسابی بۆناکەن،کەچی حەفتا پایز خاوەنەکەی ئەخاتەناخی دۆزەخەوە،وەهەندێ کردەوەی چاکەی بچوك هەیە کەموسڵمان گوێی پێ نادات کەچی خاوەنەکەی حەفتا ساڵ دەبات بەناخی بەهەشتدا)! لەحەدیسداهاتووە کەژنێك پشیلەیەکی بەند کرد وخواردنی پێ نەدا تا مرد خوای گەورەخستیە ناو ئاگرەوە ،هەروەك خوایگەورە پیاوێکی خستەبەهەشتەوەلەبەرئەوەی سەگێکی لەتینویەتی ڕزگار کرد،ئەم کردەوانە بەزاهیری کەم وبچوکن بەڵام بینیت سەرئەنجامەکە یان چەند گەورەبوو،هەرلەدونیاشداولەناوخێزانەکانداهەندێ شتی بچوك وبێ بایەخ بۆتە هۆی تێکچونی شیرازەی خێزان یان گەلێك هەراوکێشە لەناوخەڵکی داڕویداوە کەلەسەرەتاوە شتێکی بچوك وکەم باخ بووە !من دەپرسم ئایا تۆلەدەرەوە لەناو خەڵکدا خۆشەویستی؟ ئەگەر دەڵێ ی بەڵێ ئەوە بەچەند شتێکی بچوك دەستت کەوتوە، وەك ڕوخۆشی و سەلام و سەردان و هەواڵ پرسین و ڕێزگرتن و...هتد،بەم شتە بچوکانە دڵیانت ڕاکێشاوە ئەینا سەیارەوقاتەجلت بۆ نەکڕیون یان هەموویانت دەعوەت نەکردووە ،بەوهۆیەوە توانیوتە دڵخۆشی وبەختەوەری بۆ خۆت و خێزانت و هاوڕێیا نیشت مسۆگەر بکەی ،خۆئەگەر دەڵێ ی کەس خۆشی ناوێت ،هەربەهۆی شتێکی

**بچوك و بێبایەخەوەیە دڵەكانت دۆڕاندوە و خۆشەویستیت لە دەست داوە** (وتحسبونهُ هيناً وهو عِندالله عظيم)

## لەدوای ناخۆشیەكان خۆشی یە (.. انَ معَ العُسرِ يُسراً..)

**ئەی مرۆڤ بزانە كە: دوای زستان بەهارە ..تاریكی سەرەتای ڕوناكی یە.. ناخۆشی و نائارامی و فشارەكان سەرەتای بەختەوەری و حەوانەوەن ..شكست و دۆڕان سەرەتای سەركەوتنە ..لەپاش برسێتی تێری یە،لەپاش تونێتی تێراوی یە ،لەپاش ماندوبون خەوتنە ، لەپاش نەخۆشی شیفایە، دەگونجێ دواكەوتوو بگاتە جێ و لادەر ڕێگەی ڕاست بگرێ ،لێقەوما و دەروی لێ بكرێتەوە و تاریكی برەوێتەوە ، ئەگەربیابانت بینی درێژ بۆتەوە بزانە كە كۆتایی یەكەی باخ و باخاتی سەوز و سێبەری درێژ وچڕوئاوی سازگارە ..**

**ئەگەر گوریست بینی زۆرئەستوربوو بزانە كە كاتێك دەبێت بپچڕێت..**

**لەگەڵ فرمێسكدا خەندە ،لەگەڵ ترسدا ئاسایش ،لەگەڵ پەشۆكاندائارامی**

**ئاگر ئیبراهیم ناسوتێنێ، لەبەرئەوە دەرگای**(كونی برداً و سلاماً) **بەسەریدا كرایەوە دەریاموسانغرۆناكا،چونكە دەنگی ڕاستگۆی بەتین هاتە گۆو(كلا معی ربی...**

**خۆشەویستمان لەئەشكەوتدا مژدە بەهاوەڵی دەدات كە خوامان لەگەڵە ئیترئارامی و ئاسایش باڵی كێشا بەسەریاندا .. بەندەكان هەمیشە بەهۆی ئەو زروفەی كەتیایدا دەژین تەنها خەم و ماندوبون و ئازاردەچێژن لەبەر ئەوەی تەنها چوار دیواری ژورێك و دەرگاكەی دەبینن،خۆئەگەر فراوانتر بیر لەژیان بكەنەوە ئەوادەتوانن گۆڕانكاری گەورە ئەنجام بدەن ،لەبەرئەوەی كە حاڵێكتان بەسەرداهات وامەزانن ئیتر تەواو، نەخێربەڵكو ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایە و مرۆڤیش لەیەك قاڵبدا نامێنێتەوە ، باشترین بەندایەتیش چاوەڕوانی كرانەوەی دەرگای ڕەحمەتی خواییی یە ، بەڵكو خوای گەورە لەو كارەدا خێرێكی دانابێ وئێمە پێ ی نەزانین ،وە لەگەڵ هەموو ناخۆشیەكداخۆشیە ، مرۆڤ هیچ كات لەیەك قاڵبدا نامێنێتەوە ، هەموو بارو زروفێكی بەسەردا دێت ، بۆیە دەبێ هەمیشە چاوەڕوانی دەرووی خێربێ وبزانێ كە لەگەڵ هەموو ناخۆشیەكدا خۆشی هەیە ..**

## قــەرەبوولای خـوایە

**خوای گەورە شتێكتلێ ناسەنێتەوە مەگەر بە شتێكی باشتر لەو قەرەبووت دەكاتەوە ، بەڵام ئەگەر ئەوكەسە ئارامگربێ و بە بڕیاری خوا ڕازی بێ ،** {مَن اَخذتُ حَبِيبَتيهُ فَصَبرعوضتهُ منهما الجنة} **ئەونابینایەی ئارام دەگرێ پاداشتەكەی بەهەشتە، هەركەس مندا‌ڵەكەی بمرێ و ئارامگربێ وخوای گەورە بە ماڵێك لەبەهەشت قەرەبووی دەكاتەوە كە پێ ی دەوترێ سوپاسگوزاری ،ئیتر لەسەر ئەمە پێوانەی بكە ئەمە تەنها نمونە بوو ..**

**لەبەرئەوە زۆر خەمبار مەبە بە موسیبەتێك چونكە ئەوەی كە بەسەری هێناوی ، بەهەشت وپاداشت و قەرەبوكردنەوە ی بەدەستە..نزیكانی خوا ئەوانەی لە دونیادا توشی موسیبەتێك بوون فیردەوس بەم دەستەواژەیە پێشوازی یان لێ دەكات (سلام علیكم بما صبرتم فنعم عقبی الدار) .. حەقی خۆشمانە لەبەرامبەرئەو نارەحەتیانەی كە توشمان دەبێت چاوەڕوانی قەرەبوكردنەوەی خوایی بین بەڵام مەرجێكی هەیە ئەویش( ئارامگری ) یە بەڵێ ئارامگری كلیلی بەختەوەری دونیاو دواڕۆژە .. تەمەنی دونیا دیاریكراوە و دەڕوا ئەوەی دەمێنێتەوە ژیانی قیامەتە، هەرچی لێرە**

ماندوو بیٚ لەویٚ دەحەسیٚتەوە ،ئەوەی لیٚرەبترسیٚ لەویٚ ناترسیٚ، بەلاٚم ئەوی کەهەموو هیوا و ئاواتەکانی بەخۆشی ئەم دونیاوە هەلٚواسیبیٚ ئەوا موسیبەتی لەلا گەورە دەبیٚ و خەمەکانیان گەورەتر دەبیٚ چونکە بەتەمای جیٚگەیەکی ترنین تیایدا بیٚ کیٚشە بژین .. ئەی ئەوانەی توشی ئەم دەردەبوون هیٚشتا کات ماوە و هەل لەبەردەستدایە دەتوانن بیبەنەوە ،دونیا کیٚلٚگەی دوارۆژە ،هەولٚ بدەن لەم تاقی کردنەوەیەدا سەرکەوتووبن. ( لەبەرئەوەی ژیان بەهەشت نی یە مرۆڤ بیٚگومان توشی ناڕەحەتی دەبیٚ، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە کیٚ دەتوانیٚ ئارام گربیٚ؟)

## دنیا مــەدە بەکۆلٚـتا

کۆمەلٚیٚك خەلٚك هەن لەدەرون وخەیالٚیاندا جەنگی جیهانی بەڕیٚوە دەچیٚ ، لەکاتیٚکدا کەلەسەر جیٚگەی خەویانن ،کاتیٚکیش جەنگەکە کۆتایی هات دەرەنجام ودەسکەوتەکانیان بریتی یە لە نەخۆشیەکانی وەك: قورحەی مەعیدەوپەستانی خویٚن وشەکرە !لەگەلٚ ڕوداوەکاندا دەسوتیٚن ،شپرزە دەبن بەدابەزینی نرخی دراو ،بەردەوام لەناخۆشی یەکی زۆردان ،بەردەوام لەدلٚەڕاوکیٚ دان (یَحسَبونَ کلَ صیحةٍعلیهم )ئامۆژگاریم بۆت ئەوەیە کەزەوی نەدەیت بەکۆلٚتا ،یان زەوی مەخەرە سەر سەرت ،لیٚگەڕیٚ باڕووداوەکان لەسەر زەوی بن ،مەیان خەرە ناو ڕیخۆلٚەکانت هەندیٚك دلٚیان وەك ئیسفنج وایە پرۆپاگەندەوهەوالٚی ناخۆش هەلٚدەمژیٚ ،بەهەموشتیٚك خەمبار دەبیٚ و شپرزە دەبیٚ ،دەوروبەر زۆرکاری تیٚدەکاو بەدەسکەوتەکانیان بیٚتاقەت دەبیٚ ،ئەم جۆرە دلٚە زۆر بەئاسانی دەتوانیٚ خاوەنەکەی لەبناغەوە لەبن بیٚنیٚ ،کەسانی خاوەن بیروباوەڕ پەندوئامۆژگاری وەردەگرن و باوەڕیان زیاد دەکات ،کەسانی لاوازیش کیٚشەکان هیٚندەی تر دەیان ترسیٚنیٚ ، وەدلٚیٚکی ئازاو دامەزراو لەسەر خۆو کراوە دەتوانیٚ خۆگر بیٚ لەبەردەم ڕەشەباکانی ژیاندا ، نەك دلٚیٚکی ترسنۆك کەڕۆژانە چەندین جار خۆی سەردەبڕیٚ بەشمشیٚری پیٚشهاتو وەهم وخەوەکان،گەرژیانی بەختەوەریت دەویٚ ئەوابەئازایانە ڕوبەڕوی ڕوداو وپیٚشهاتەکان ببەرەوە ،گەرنا هەموو ساتیٚکت مردن وهەموکاتیٚك خەمووخەفەت ودلٚە ڕاوکیٚ یە،(گەر ژیانیٚکی بەختەوەرانەت دەویٚ ،ئەوابە ئازایانە ڕوبەڕوی ڕوداوپیٚشهاتەکان ببەرەوە ، چونکە بەختەوەری ئەستیٚرەیەکە تەنها لەئاسمانی ئازاوڕوخۆشەکانداهەلٚدیٚ.

## گەشبین بە بــەداهاتوو

یەکیٚکی تر لەهۆیەکانی بەسود بۆژیانی خۆشنود، گەشبینیە بە ژیانی داهاتوو کەهاندەرو پالٚنەرە بۆ چاکەکاری و بەختەوەری، مرۆڤی گەشبین لایەنە باشەکانی ژیانی دەخاتە بەرچاوی و دلٚخۆش دەبیٚت، بەلاٚم کەسی ڕەشبین تەنهالایەنە خراپەکانی ژیان دەبینیٚ ،گەربەچاویلکەی ڕەش سەیری دونیا بکەی ڕوناکی تیٚدا نابینی وڕەش دەکاتەوە ، بۆنمونە:پەرداخیٚکی نیوە لەئاو گەرلەگەشبین بپرسی ئەلٚیٚ تانیوەی پڕە ، بەلاٚم ڕەشبین ئەلٚیٚ تانیوەی بەتالٚە ،گەرهەردوکیان سەیری گولٚ بکەن ڕەشبین دڕکەکانی ئەبینیٚ ،بەلاٚم گەشبین

گوڵەکانی دەبینیٚ کەئەوەش کاریگەری خۆی بەجیٚ دیٚڵیٚ لەسەر بواری دەرونی (سایکۆلۆژی) مرۆڤەکە بۆیەپیٚغەمبەری ئیسلام (د.خ) هانمان دەدات کەگەشبین بین لەژیانداو گومانی چاك بەرین بەخەڵك بەژیان نەك بیر لەخراپە بکەینەوە ودنیامان لیٚبیٚتەوە یەك فەرمویەتی :(تفالوا بالخیرِتجدة) واتە:(پیٚشبینی خیٚر بکەن دەیدۆزنەوە )لەبەرئەوە تەرکیزی هیٚزو توانات بخەرە سەرئەوئاکامە ئیجابیانەی کەبەدەستی دیٚنیت .پیٚشبینی باشترین شت بکە لەخەڵکدا وەباشترین شت لەهەڵویٚستەکانتدا وباشترین شت لەخۆتداوەلەژیاندا ،لەئیٚستاوە بەپیٚشبینیەکانت خۆت بەرزبکەرەوە وگەشبین بە،(هیلین کیلر) دەڵیٚ:(گەشبینی ئەوئیمانەیە کەبەرەو سەرکەوتنت دەبات ) وەلەبەرانبەردا دکتۆر (دنیس وتلی) وتویەتی (پیٚشبینیە سلبیەکان ئاکامی بەدبەختی لیٚدەکەویٚتەوە ) ،خەڵکە بەدبەختەکان تەرکیزدەخەنەسەردۆڕان و خاڵە لاوازەکانیان ،بەلاٚم خەڵکە بەختەوەرەکان تەرکیز دەخەنە سەر هیٚزو تواناو لیٚهاتوییەکا نیان لەداهیٚناندا ،لەبەرئەوە گومان و پیٚشبینیەکانت هەرچی بیٚت (سلبی یان ئیجابی) ئەواچارەنوست دیاری دەکات ،پەندیٚك هەیە دەڵیٚت :(ئیٚمە خۆمان دەبینە هۆکاری دروست بونی تۆزو خۆڵ ،پاشان گلەیی دەکەین کەناتوانین شت بەباشی ببینین) زۆر جار دۆڕان و شکستەکان بەهۆی کردارو گوفتاری خراپی خۆمانە کەڕەنگدانەوەی بۆچونەکانمانەو گلەیی و گازندەش لەبەختی خۆمان دەکەین !،(دکتۆر مستەفا محمود) لەکتیٚبی (عەقڵ و جەستە) دا دەڵیٚ :(لەسەر ڕیٚگەی ژیاندا ئەوە دەدۆزینەوە کەپیٚشبینیمان کردووە) ،سەرجەم وتەی زانایان و دانایان لەوبارەوە پشتگیری ولیٚکدانەوەی فەرمودەکەی پیٚغەمبەرە(د.خ)، عەقڵی ناوەوەت جیاوازی ناکات لەنیٚوان ڕاستی و ناڕاستی دا تەنها ئەو کارە دەکات کەتۆپیٚی دەڵیٚ ی ،بەگویٚرەی پیٚشبینیەکانت ئەگەر بڕیارتدا کەدەتوانم ئەوکارەبکەم یان ناتوانم ئەوە لەڕاستی دا هەرئەوە ڕودەدات ،پیٚشینانیش وتویانە :(ئەوەی لەخیٚو بترسیٚ بۆی دیٚت ) .بۆیە گەشبین بەو بەئیجابی بیر بکەوە و کردارو گوفتارت باش بیٚت و بەئیمانەوە بژی ..بەئاواتەوە بژی .. بەخۆشەویستی یەوە بژی .. بەهەوڵدانەوە بژی و بەهای ژیان بزانە

## زەردەخـــەنـە

{زەردەخـەنە دوژمن دەکات بەدۆســت } (جۆرج نیکۆلا)

پێویستە لەسەرەتاوە ئەوە بزانین کەپێکەنین حەرام نییە،یان وابزانی کەموسڵمان دەبیٚ گرژومۆن بێت ،چونکە پێکەنین لەسروشت وفیترەتی مرۆڤە ﴿..وانه هوأضحكَ وابكى..﴾،بەڵام ئەوەی کاریگەری ئیجابی ورەنگدانەوەی باشی هەبێت لەسەرناوەوەودەرەوەی مرۆڤ زەردەخەنەیە ، نەك پێکەنین بەدەنگی بەرزوقاقا،لەفەرمودەدا هاتووەکەپێغەمبەر ﷺ دەم بەزەردەخەنەبووە{..كانَ لايَضحكُ اِلا تبَسُماً } (رواه احمد 97/5)، دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە(خ) فەرمویەتی : {هەرگیز نەم بینیوە پێغەمبەر (د.خ) واپیٚ بکەنیٚ مەلاٚشوەکانی دەرکەوتبیٚ،بەڵکو تەنها زەردەخەنەی دەکرد} ،لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا(د.خ)هانمان دەدات کەبەڕوی خۆش وزەردەخەنەوە لەخزمەت خەڵکدا بین {لاتحقرن مِن المعروف شيئاً ولوا أن تلقى اخاك بوجه طليق} (رواه مسلم) واتە: لەکاری چاکەدا هیچ شتێك بەکەم مەزانە،گەرئەوەش بیٚ کەبەڕویەکی خۆشەوە بەرەوڕوی براکەت ببیتەوە ،ئەوەتا ڕووی خۆش و پێکەنین بەچاکەمان بۆ دەنوسریٚ،چون بەوە خۆشی ئەخەیتە دەرونی خۆت و بەرانبەرەکەت ، کەواتە بەشێوەی زەردەخەنە پێبکەنە ..دنیا لەگەڵتا پێدەکەنیٚ ،بەڵام پێکەنینی قاقاو دەنگی بەرز باش نی یە وپەسند نەکراوە چون لەڕوی کۆمەلاٚیەتی یەوە نەریتێکی نەگونجاوە ،وەلەبواری دەرونی و(سایکۆلۆجی) دا کاریگەری خراپی هەیە لەسەردڵ و دەرون ،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {لاتكثروا الضحكَ ،فان كثرة الضحك تميت القلب،..وفى ريواية فَسادالقلب } واتە:پێکەنینی زۆر دڵ خراپ دەکات ! بەڵام زەردەخەنەی بەردەوام جوانترین ئارایشی ڕوخسارە ،باشترین چەکە لەدژی ناخۆشیەکانی ژیان،هۆکاری بەختەوەرییە . بەداخەوە هەندیٚ کەس چاك بەخراپ و زەردەخەنە بە پێکەنین دەگۆڕنەوە ! ئەڵیٚ : بەپێکەنین خەم بەبائەدەم ودەرونم ئاسودە دەکەم !، ڕۆژیٚ برایەك گەنجێکی بینی بوو کە بێتاقەت وخەمباربوو،لیٚ ی پرسی :ئەوە بۆکویٚ ئەچی؟ وتی ئەڕۆم بۆلای فلاٚنەکەس بۆئەوەی بمخاتە پێکەنین و ماوەیەك بیکەین بەبەزم و خەمەکانم بڕەونەوە ، بەڵام ئەوبێئاگایە لەوەی کەئەم جۆرەپێکەنینە وەك ماددەیەکی بیٚ هۆشکەروایە و دوای تەواوبونی پێکەنینەکە خەمەکانی دەگەڕێنەوە چونکە لەناخەوە چارەسەرنەکراوەوبگرەخەمێکی تری بۆزیادکراوە،کاتێکی لەدەست داوە ،لەبەرئەوە دەبیٚ بەئاگابین لەڕێگەو ڕێبازی پێغەمبەری خۆشەویستمان (د.خ) بۆچارەسەرکردنی کێشەکانی ژیانی بەردەوام بەزەردەخەنەوە لەبەرانبەرکێشەکان دەوەستا وکاتیٚ دوچاری خەم وناخۆشیەك دەبوو دەیفەرموو: {ياحَىُ ياقيوم برحمتكَ أستغيث ..} (صحيح الجامع / 4777) هاناوپەنای بۆخوادەبرد،چون چارەسەری بنەرەتی لای خوایە ،نەك لەکۆڕی پێکەنین و گاڵتە جاڕی. لەفەرمودەیەکی هەڕەشە ئامێزدا بۆئەوانەی کەدرۆودەلەسەو گاڵتەجاڕی دەکەن بۆئەوەی خەڵکی بیٚ ئاگابکەن لەژیان وپێکەنینی درۆینە یان بۆدروست دەکەن پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {وَيلٌ لِلذى يحدث فيكذب ليضحك القوم ،ويلٌ له ، ويل لهُ ) } (حسن،صحيح الترغيب/2944/3)واتە:وەیل وسزاوناخۆشی بۆئەوانەی کەقسەی درۆئەکەن بۆئەوەی خەڵك پێبکەنیٚ .

**دیاره ڕێنماییەکانی خۆشەویستمان پڕیەتی لەحیکمەت و هیدات ،ئەوەتا لەڕووی زانستیەوە پزیشکەکان دەڵێن: زەردەخەنە(6) ماسولکە دەجولێنیٚ لەڕوخساری مرۆڤدا ،بەلاٌم گرژی ومۆنی (72) (عَضَلە) ی دەم و چاو دەجولێنیٚ، ئەوکەسەی لەبەرانبەر کێشەکاندا بەزەردەخەنەوە پێدەکەنیٚ ئەوا ماسولکەکانی دەم و چاوی فراوان دەبێت و بەوەش ئۆکسجین زیاترو زۆرتر دەگاتە ماسولکەکان و لەوێشەو وە بۆناوخوێن کەئەوەش دەبێتە مایەی بەهێزبوون وخۆڕاگری ئەوکەسە بۆیە ئەوانەی دەم بەخەندەن کەسانی دامەزراون وبەتوانان وتەندروست باشن،وەئەوانەش کەوەك فیشەکە شێتە هەڵدەچن وتوڕەوگرژومۆنن لەڕوی دەرونی و جەستەییەوە نەخۆش وناتەواون، دەتۆش و ڕوگەش و ڕوخۆش بە بۆبەختەوەری خۆت و خەڵکی چونکەدنیا کاتی یەو تەمەنیش کەم وکورتە وبەشی ئەوهەموو خەم و خەوفەتە ناکات (خەفەت ... خەفەت ئەکات) خەفەتی دووەم لەڕستەکەدا مەبەستی خەفەبونە.**

## خۆشیەکانی بەهەشت بێنە بەرچاوت

**ئەگەر لەمماڵەدا برسی بووی یان هەژار بووی یان خەمباربووی یان نەخۆش بووی یان ستەمێکت لیٚ کرا ئەوا خۆشی و لەش ساغی و ئارامی و نیعمەتەکانی بەهەشت بێنەرە پێش چاوت ،کاتێك بەم جۆرە بیر دەکەیتەوە و باوەڕت بەوشێوەیە بێت ئەوا زیانەکانت بۆدەبێتە قازانج ،موسیبەتەکانت لادەبێتە بەخشش ..، ژیرترین کەس ئەوانەن کەدواڕۆژیان لەبەرچاوە چونکەئەویٚ بەردەوامە هەتاهەتایی یە تیای دا دەمێننەوە ، ئەوپەڕی نەزانیش ئەوەیە کەوا بزانی دونیا هەموو شتێکە !ئەم کەسانە بچوکترین شت شپرزەیان دەکات ، موسیبەتێك توشی خەمێکی گەورەیان دەکات ،چونکە تەنها بۆ خۆشیەکانی ئەم دونیایە دەڕوانن و کاتێکیش لەدەستیان دەچیٚ هیوایەکی تریان نی یە، نایانەویٚ ئەو خۆشیانەیان لەدەست بچێت .. ،بچن لە ڕێگەی دینەوە باسی بەهەشت ببیستن ،بیهێننە پێش چاوتان کەتیایدا دەژین نەخۆش نابن ، پیر نابن ،خەمبارنابن**

، نامرن ،لەناو ئەوژورانەدا کەلەناوەوە دەرەوە دەبینن ،لەویٚ شتی وای لیٚ یە کەچاو نەیبینیوە ، گویٚ نەیبیستوە ، تەنانەت بەدڵی مرۆڤیشدا نەهاتوون ،سوارێك لەژێرسێبەری دارێك دا دەڕوات بۆماوەی سەدساڵ ڕێگە دەبڕیٚ تەواونابیٚ! ئەمە تەنها نمونەیەکی زۆر کەمە لەنیعمەتە کانی بەهەشت،ئەگەر سەرئەنجامت بۆئەو شوێنەبیٚ ئایا ئەوە ناهێنیٚ کە گرنگی پیٚ بدەی؟لەو هۆکارانە بکۆڵیتەوە کە دەتگەیەنیٚ بەو شوێنە؟ هەوڵ بدەی بۆ بەدەستهێنانی؟ کەواتە ئەی مرۆڤ ، هەرکات توشی ناخۆشی بووی ، هەرکات تووشی خۆشی بووی،بەهەشتت لەیاد بێت ،تاکو لەو بەرزیەوە بڕوانیتە دونیاو خۆشی‌وناخۆشیەکانی لەچاو ئەوێدا وەك خۆی ببینی،ئەوسا بزانە بەختەوەری

## ( دە ) هۆکاری بەسود ....بۆژیانی خۆشنود

1) پاڕانەوەی لیٚخۆش بوون لەبەیانیاندا ﴿..والُمستَغفرينَ بِالاَسحار...﴾

2) بیرکردنەوە لەتەنیایدا، لەم یاسایەلەم گەردونە ..لەم ژین و مردن بوونە ﴿..ويتَفكرونَ فى خلقِ السَموات وَالاَرض..﴾

3) دانیشتن لەکۆڕی پیاوچاکاندا(واصبرنفسك مع الذين يدعون ربهم...)

4) زیکرویادی خوا (اذكروا الله ذكراً كثيراً...)

5) دووڕکعات نوێژ بەگەردن کەچی وبەدڵ وبەگیان (والذين هم فى صلاتهم خاشعون

6) قورئان خوێندن بەتێگەیشتنەوە (افلا يتدبرون القران..

7) بەڕۆژوبوون لەکاتی گەرما (يدَع طعامه وشرابه وشهوته من اجلى...)

8) خێرێك بەنهێنی کەس پیٚ ی نەزانیٚ (حتى لا اتعلم شماله ماتنفق يمن

9) لابردنی خەم و ناخۆشیەك لەسەر مسوڵمان (من فًرج عن مسلم كربه

10) دنیا بەکەم گرتن (..والاخرة خير وابقى ..)

(تِلكَ عَشرةُ كامِلة...) ئەوە دەگوڵی بەسود وبۆندار بۆبەختەوەری ئیماندار.کلیلی بەختەوەری دووکەلیمەی شایەتمانە:(لااله الاالله،محمد رسول الله)هەرکەس لەزەوی دانی پیانا بەڵێی ڕاستی بۆ دەکریٚ لەئاسمانا،هەرکەس کردەوەی پیٚکرد لەسزای ئاگر خۆی ڕزگار کرد.

## کەواتە بەختەوەری لەچی دایە؟

(كُن فى الدنيا كانكَ غَريب او عابرِ سبيل...فطوبى للغُرَباء)

خۆشی و بەختەوەری لەكۆشك و تەلاری دەسەلاْتدارەكاندا نی یە،لەهێزی سوپاو ڕاگەیاندن وبانكەپڕەكانیاندا نی یە،لەپارك و سەنتەرەكاندا نی یە لەدیكۆرو جوانكاری دا نی یە،بەختەوەری شتێك نی یە بكڕدرێ ،گوڵێك نی یە بۆن بكرێ ،خواردەمەنی نی یە بكێشرێ ...،بەڵكو خێرو خۆشی یەكی ئیمانی یە كەلەناو دڵدا جێگیر دەبێ ،شادی و فراوانی دڵ و دەرونە بۆ شتێ كەقەناعەتی پێیەتی . ئێمە وادەزانین كەبەختەوەری لەكۆشك و تەلارو سەروەت و سامان و سەیارەی مۆدێل بەرزو تێركردنی حەزو ئارەزووەكاندایە ،بەلاْم ئەوانە زۆرجار دەبنە مایەی سەرقاڵی وخەم وخەفەت و گێرەو كێشە بۆمان ! چاكترین و گەورەترین مرۆڤ لەم جیهانەدا پێغەمبەری خودایە ﷺ كەبەهەژاری ژیاوە بەمانگ ئاگر لەماڵیاندا نەكراوەتەوە خورماو ئاویان خواردووە !بەلاْم لەگەڵ ئەوەشدا لەلوتكەی بەختەوەریدا ژیاوە ، لە ئاسودەیی دڵ و دەرون و لەئارامی و لەسەرخۆی و لەكردارو گوفتاری شیرینی ...(وكانَ فضلُ اللهِ عليكَ عظيماً) چونكە چاكەكاری خۆشی و ئارامی دڵ و دەرونە (البرُ طمانينة والاثم ريبة) واتە : چاكە ئارامی دڵە وخراپەوتاوانیش گومان ودودڵی یە،ئەوەی پاكە بێباكە.

بەلاْم دوڕوو درۆزن و خراپەكار لەهەموو شتێك سڵ دەكاتەوە وبەگومانەو ئیسراحەت ناكات لەژیانیدا (يَحسبونَ كلَ صيحةِ عليهم ) چونكە چی بچێنی ئەوە دەدوریتەوە ،جائەو دەوڵەمەندی یە بەچی ئەچێ كەدڵی داخراو بێت و مێشكی ماندوو بێت خەیاڵی ئاسودە نەبێت وەك قارون و فیرعەونەكانی زەمانە كەلەژیانی خۆیانیش ئەمین نین و دواڕۆژی خراپیش چاوەڕێیانە و مێژوش ڕوحم بەكەس ناكات . جابزانە كە بەختەوەری دنیاو دواڕۆژ لەپاراستنی دینەكەتدایە كەگەورە ترە لەسەروەت و سامانی كیسراو قەیسەرەكان ،چونكە هەردینە لەگەڵتا دەمێنێتەوە تالەبەهەشتا جێگیرت دەكات ، بەلاْم ملْك و ماڵ و پلەوپایە كاتی یە وڕولە كۆتایە خاوەنەكەی لەگومان و ترسی دواڕۆژدایە. دیارە ئەگەر لەكەسێكی نەخۆش بپرسی بەختەوەری چی یە؟ ئەڵێ چاك ببمەوە لەنەخۆشی و ئازارم نەمێنێ ،خۆئەگەر لەقەرزاریش بپرسی بەختەوەری چی یە ؟ ئەڵێ قەرزەكانم لەسەرلابچێ و منەتی كەسم بەسەرەوە نەمێنێ ،چونكە قەرز خەمی شەوانەوڕوزەردی ڕۆژانە، وەهەروەها ترسنۆك دەڵێ :بەختەوەری نەمانی ترسە ،وەئەوكەسەیش كەمناڵی نابێ ئەڵێ بەختەوەری ئەوەیە كەخوا كوڕو كچم بداتێ، هەركەسە بەپێ ی ئاوات و خەمەكانی خۆی بەختەوەری دیاری دەكات ،بەلاْم هەموو ئەمانە بیرۆكەن و بەسەردەچن ، بەڵكو بەختەوەری ڕاستەقینە واتە: سەركەوتنی ڕاستەقینە كەتەنها لەیەك سەرچاوە هەڵدەقوڵێت كەئەویش پەیوەست بوونە بەپەیامی خوای گەورەو هەركەسێ دەستی پێوە بگرێ قەت گیرۆدە نابێ .دەڵێن فلاْنەكەس بەیانسیب سەیارەیەكی بۆدەرچوو ئیتر تەواو سەركەوت !بەلاْم لەئیسلامدا بەجۆرێكی ترەو سەركەوتنەكەی گومانی حەرام و ڕیبای لێدەكرێ و نەفرەت

لێکراوە،یان دەڵێن فلآنەکەس بردیەوە ،نا وانی یە بەڵکو بردنەوە لەئیسلامدا ﴿..فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ ﴾(آل عمران185) ئەوەی لە ئاگری دۆزەخ دور خرایەوەو خرایە ناوبەهەشت ئەوەسەرکەوتو براوەیە وژیانی دنیاش بێجگە لەڕابواردنێکی کەم وفریودەر هیچی ترنییە.

## لەئیســلامدا خەم وخەفەت داوانەکراوە

دیارەلەبەرانبەرخۆشی وبەختەوەری دا خەمبارییە ،کەجیٚ ی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەیەکی کورتی بۆبکەین،چونکەلێرەولەویٚ بەرگوێمان دەکەویٚ و دەڵێن ئیسلام لەگەلٚ خۆشی وشادی دا ناکۆکە! دەڵێن گەرپابەندبین بەدینەوە ئەبیٚ بەردەوام خەمبارین و(ببینەمامەخەمە) ونابیٚ شادی دەربڕین یان پێبکەنین ..هتد،بێگومان وێنەی ئەم قسانەلەبێئاگایی یەوە سەرچاوەی گرتووەو پێچەوانەکەی ڕاستە ،چ وەلآمێکیان هەیە بۆدەقەکانی وەك:(..فَبِذلكَ فَلَيَفرحوا...)،(ولا تَهِنوا ولاَتَحزنوا) واتە:خەمبارمەبن و خەفەت مەخۆن لەسەرئەوەی کەبەسەرتان هاتووە،وەدەیان فەرمودەی وەك :(يسروا ولاتعسروا بشروا ولاتنفروا...) واتە:ئاسانکاری بکەن شت قورس وگران مەکەن،مزگێنی وهەواڵی خۆش بدەن بەیەکتر نەك شتی ناخۆش.وەفەرمودەی:(وأن يتناجى الاثنان منهم دون الثالث ،لان ذلك يحزنه )گەرسیٚ کەستان پێکەوەبوون نابیٚ دوانتان پێکەوە چپەبکەن چونکە ئەوی تر دڵگران و خەمبار دەبێت،وەفەرمودەی (ابتسامتك فى وجهِ اخيك صدقة) ڕووخۆشی و زەردەخەنەلەبەرامبەر براکەت چاکەیە،ئەمانەودەیان فەرمودەی تر مەگەر هەمویان لەبەر دڵی مرۆڤەکان نی یە؟وەئەو ڕاستیە دەسەلمێنن کەئیسلام خەم لابەرەو شادی هێنەرە،ئیسلام بۆڕێکخستنی ژیانی مرۆڤەکان هاتووە تاکو بگەنە لوتکەی بەختەوەری دنیاو دواڕۆژ بۆخۆشی و بەختەوەری یەکی بەردەوام و ڕاستەقینە،نەك خۆشی یەکی ڕۆتینی وڕوکەشی و کاتی وەك مۆم داگیرساندن یان هێنانی چەپکەگوڵێکی لاستیك یان تەنها ساتیٚ بۆخۆشی و پیاسەیەك وداوەتێك وئاهەنگیٚ ... ،ئێمە خۆشی یەکمان دەوێت کەدلٚ و دەرونمان بەهێز بکات کەئەویش تەنها لەئیسلامدا بەرجەستە کراوە ئیسلام ڕێگری کردووە لەخەم و پەژارە چونکە خەفەت بۆدلٚ زۆر خراپە و پاشان دوچاری چەندین نەخۆشیت دەکات وەخاوەنەکەی وەك لێقەوماو داڕوخاو داماو زەبون نیشان دەدات ،وەشەیتانیش زۆر حەزدەکات وهەولٚ دەدات کەمسوڵمان خەمبار بکات و لەو ڕێگەیەوە کاری خۆی بکات ، وەداواکراوە لەمسوڵمان کەبەرەو ڕوی خەمەکانی بێتەوە بەڕێگەی شەرعی و تەسلیمی خەم و خەفەتی شەیتانی نەبێت ،چونکە خەم باری مەبەست و داواکاری شەرع نی یە وپێشەواکەمان (د.خ) خۆی لیٚ پاراستووە وفەرمویەتی:{اَللهُمَ اني اَعوذ بك الهَم والحزن} واتە:خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەخەم وخەفەت، هەمم و خەم بۆ شتی داهاتوەو خەفەتیش بۆشتی ڕابردووە، کەهەردوکیان دلٚ لاواز دەکەن وجەستەولاشە شەکەت وماندوو دەکەن و لەزەرەدو زیان بەولاوە هیچ سودێکیان نی یە . وە نەخۆشی و ناخۆشیش کەبەسەر مرۆڤ دێت وهیچ دەسەلآتێکی تێدانی یە ئەوەجۆرێکە لەتاقیکردنەوەو

پێویسته بەهۆكاره شەرعی یەكان وەك صەبرگرتن و دوعاوپاڕانەوەو كاری ژیرانه لەڕوی بوەستینەوە،چونكه هەمووكەس توشی ناخۆشی دەبێت لەدنیادا بەلأم بۆمسوڵمان دەبێته كەفارەتی تاوانەكانی بەوەش جۆرێك لەدڵخۆشی بۆدێت ،وەك خوای گەوره لەسەر زمانی ئەهلی بەهەشت كاتیٚ كەچونه بەهەشتەوه فەرموویەتی :(الحَمدللهِ الذی اَذهبَ عنا الحَزن )، وەهەندێك خەم خواردنیش نیشانەی ئیمان وهیدایەته وەك خەمباری لەسەر ئەوەی كەگوناهو تاوانی ئەنجام داوەو بیٚ فەرمانی خوای كردووه،یان نوێژو ڕۆژوی فەوتاوه یان ناوی دەرنەچووه بۆحەج ،یان ئەوانەی كاتی خۆی دەهاتنه خزمەت پێغەمبەر (د.خ)بۆئەوەی بچن بۆغەزا بەلأم هیچیان نەبووبیبەخشن ویان هیچیان دەست نەدەكەوت پیٚ ی بڕۆن و بەخەمباری دەگەڕانەوه بۆماڵ بەپێچەوانەی مونافیقەكان.پوختەی قسان لەوبارەوه ئەوەیه كەدین داوای لەكەس نەكردووه بەخەمباری بژیەت و خەم و خەفەت بەعیبادەت بزانریٚ چون ئەگەر ئەوەڕاست بوایه ئەواپێغەمبەر (ﷺ) هەموو ژیانی بەخەم و پەژاره دەبردەسەر ،بەلأم بەپێچەوانەوه بەردەوام سینەپاك و كرداروگوفتار شیرین و ڕوخۆش ودەم بەزەردەخەنەوه بووه .هەندێك ڕیوایەتیش گێڕدراونەتەوه كەهانی خەمباری دەدەن بەلأم سەنەدەكانیان نەزانراوەو ئەو فەرمودانەش بەڕاست دانەنراون ،وەك ئەوەی (هندی ابی هاله) لەباسی پێغەمبەر هێناویەتی (انهُ كانَ مُتواصلَ الأحزانِ)ئەمه جگەلەوەی سەنەدەكەی نادیاره ،پێچەوانەی حاڵەتی پێغەمبەره (ﷺ)،چۆن بەردەوام خەفەتبار دەبیٚ لەكاتێكدا خواپاراستویەتی لەخەمی دنیاودواڕۆژ،وەلیٚ ی قەدەغەكراوه خەم لەبێباوەڕان بخوات ،وەلەگوناهی بەرو دوای خۆش بووه ،چونكه ئەوهاتووه بۆلادانی خەم و پەژاره بۆنەهێشتنی ترس وگومان و دڵەڕاوكیٚ هاتووه بۆڕزگاركردنی بەندەكان لەشیرك پاكردنەوەی دەرونەكان لەپیسی ...،وەهەروەها ڕیوایەتی (اِنَ الله یحبُ كُل قلبِ حَزین ) یش بەهەمان شێوه سەنەدەكەی نەزانراوه مانای فەرمودەكەش كەهاندەری خەم و پەژارەیه لەگەڵ ماناو مەبەستی پەیامەكه ناكۆكەو نەگونجاوه . دیاره كۆمەڵی ڕیوایەتی تریش هەن لەوبارەوه لاوازن ،چونكه خەمباریش موصیبەتێكەو بەندەی پیٚ تاقی دەكرێتەوه وەسەبارەت بەخەمباری حەزرەتی (یەعقوب) (د.خ) بۆكوڕەكەی (وابیضَنت عَیناهُ مِنَ الحُزنِ فهوَ كظیم ) ئەمه خەبەرێكه بۆحاڵەتی یەعقوب بەهۆی ئەو تاقیكردنەوەی كەبەسەری هات بەهۆی دابڕان لەحەزرەتی (یوسف) تەنها هەواڵه نەك هاندان و داواكردنی خەمباری ،چونكه خەم و خەفەت پەڵە هەورێكی دزێو قورسە، شەوەزەنگێكی تاریكه وەكۆسپ و تەگەرەی ڕێگای ڕێبوارانه .جاپێویسته لەسەرت بەنیعمەتەكانی ئیمان و لەش ساغی و دڵ و دەرون پاكی و دڵخۆش بیٚ وژیانی خۆت و ماڵ و منداڵیشت بخەیتەوه خۆشی یەوه،نەك وابزانی بەردەوام پاپۆڕەكەت لەدەریادا نوقوم بووه ودنیات لیٚ ببێته چەرمی چۆلەكەو سەری كێوانت لیٚ بێتەوه یەك بەبیٚ سودو قازانج ، تەنانەت هەندیٚ لەزانایان وتویانه:لەدنیادا بەهەشتیٚ هەیه هەركەس نەچێته ناوی ناچێتەبەهەشتی دواڕۆژیش ،خوای گەوره بەدورمان كات لەخەم و خەفەت وناخۆشی

،دڵ و دەرونمان فراوان بكات و ڕێنمونیمان بكات بۆبەختەوەری دنیاو دواڕۆژ ....ئامین .

♈

## خـەمبارمـــەبە

- **خەمبارمەبە: چونكە سارد دەبیتەوە لەبەندایەتی پەكت دەخات لەتێكۆشان لەناخەوە دەتهەژێنێ..دەتروخێنێ   گومانی خراپت بۆدێنێ ،ژیانت لێ دەشێوێنێ .**
- **خەمبارمەبە: خەم و خەفەت دەبێتەهۆی دودڵی و خەمۆكی و نەخۆشی یە دەرونیەكان وسەرچاوەی ئێش و ئازارو ژانە .**
- **خەمبارمەبە: كەتۆخاوەنی قورئان و زیكرو دوعاو نوێژوخێرو چاكەكاری ،ئیتر تاكەی بۆخەمباری .**
- **خەمبارمەبە: خۆت مەدەرە دەست شەپۆلی خەمەكان ومەڕوخێ و دامەمێنەبەهۆی بێكاری ،سەردان بكە..بخوێنە بنوسە ..كاربدۆزەوە ..بیربكەوە ..گەشبین بەبۆداهاتوو .**
- **بۆچی خەم دەخۆی ؟(شێخ جونەیدی بەغدادی)بەلای پیاوێكدا ڕۆیشت بینی زۆرخەمبارو داماوە !شێخ پرسی:لەوەدەترسی كەزوتر بمری لەوماوەیەی كەبۆت دیاری كراوە ؟ وتی نەخێر ،شێخ لێ ی پرسی :ئایا ئەوڕزقەی كەخوابۆتی دیاری كردووە كەس دەتوانێ بیبات و بیخوات ؟ وتی نەخێر، كەواتەخەمی بۆچی یەو بۆچی خەمباری ! ؟**

## بەختیاری خێزان.... بەڕەوشتی جوان

ئیسلام زۆر گرنگی داوە بەپڕۆسەی هاوسەرگیری ودروست کردنی خێزان ،هەرلەسەرەتاوە مەرج وبنەمای بۆداناوە بۆئەوەی خێزانێکی بەختەوەرو سەرکەوتووبن لەژیاندا،چونکە یەکەی خێزانی بەردی بناغەی کۆمەڵگایە ،ئەگەر خێزانەکان لەسەر بنەمایەکی ڕاست و دروست دامەزران ئەوە کۆمەڵگایەکی بەختەوەرفەراهەم دێنن ، ئامانجی ئیسلامیش لەدروست بوونی خێزان بەردەوامی و بەختەوەری یە ،بۆیە لەو پێناوەدا فەرمان بەپیاوان دەکات بەجوانی لەگەڵ ئافرەتان بجوڵێنەوە ،(وعاشروهن بالمعروف) وەبەهەمان شێوەیش فەرمان بەسەر ئافرەتان دا دەکات کەدەبێ مێردەکانیان لێ یان ڕازی بن وجوان هەڵسو کەوتیان لەگەڵ دابکەن ،وەك لەفەرمودەدا هاتووە لەوەڵامی ئەوەی کەبۆچی جیهادیان لەسەر پێویست نەکراوە (حسن تبعلكن يعدل ذلك ) بەهەڵسوکەوتی جوان لەگەڵ مێردەکانیان پاداشتی غەزایان دەست دەکەوێت !جائەگەر بەختەوەریت ئەوێ لەژیانی هاوسەری دا ئەوەپەنابەرەبەر هەڵس وکەوتی جوان وشیاو، چون دین بۆڕێکخستنی ژینە،دین مامەڵەیە:(الدينُ المُعامَلة) کرداروگوفتاروڕفتارە، بەڵام سەرەتا ئەبێ لەخۆمانەوە دەست پێ بکەین بۆئەو مەبەستە بەکورتی تیشك ئەخەمە سەر هەڵس وکەوتی هەردوولایان:

**یەکەم:هەڵس وکەوتی پیاوان :**

مسوڵمانی ڕاستەقینە کەسێکە زۆر بەوردی ئاگاداری ژیانی خێزانی یە ولەخەمی بەدەست هێنانی خۆشی و کامەرانییەو بەلایەوە بەختیاری خێزان لەسەروی هەموو شتێکەوە یە،بۆیەنابێ بەچەند شتێکی بێ بایەخ لەدەستی بدەین و شتی بچوك گەورە بکەین ، وەك:ئەوەی هاوسەرەکەت هەندێ کاری کردووە پرسی پێت نەکردووە ،یان ئەگەر هەندێ جار بەگوێ ی نەکردیت ئیتر تۆش دنیات لێ بێتەوە یەك وبیکەی بەشەڕوهەرا،یان جارێك چێشتەکەی درەنگ پێ بگات یان کراسەکەی بۆئوتو نەکردبی یان ....،وەك بڵێ ی قەت چاکەی لەگەڵ دانەکردوی ،بەڵکو پێویستە لەبەرانبەریاندا وەفادار بین وڕێزوخۆشەویستی و قسەی خۆش وجاربەجار شیرینی یان چەپکێ گوڵی پێشکەش بکەو دەست خۆشی لێ بکەلەسەرکارو خزمەتی ماڵ ومنداڵی وپێکەوەسەردان و گەڕان بکەن ،تەنانەت پێغەمبەری خوا(د.خ) لەبەردڵی خەدیجەی خێزانی کەس و کاری خەدیجەشی خۆشت دەویست ،تاپاش مردنیشی هەواڵی هاوڕێکانی دەپرسی ،جارێکیان لەگەڵ پیرێژنێك زۆر وەستاو قسەی لەگەڵ کرد،عائیشە لێی

پرسی ئەم پیریژنە کێ بووئەوەندە لەگەڵی وەستای؟ پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی ئەوەیەکێك بوو لەهاوڕێکانی خەدیجەو کاتی خۆی سەردانی دەکردین !ئایا پرسیارت لەخۆت کردووە کەئەگەر پێغەمبەر (ﷺ)لەگەڵ هاوڕێیانی خەدیجەدا ئاوا دڵسۆزی نواندبێ ئەی دەبێ لەگەڵ خەدیجەدا چۆن بوبێ؟! ئەی جەنابت چۆن بەختیاری خێزان بەدەست دێنی کەهێشتا بەتەواوەتی خزمی خێزانەکەت ناناسی چونکە دەوڵەمەند نین یان ...تەنانەت لەکاتی ڕوودانی کێشەو هەرادا دەبێ پشتی خێزانەکەت بگری نەك بە قسەی خەڵك یان بەگومانی خۆت یان هەندێ شتی بێ بنەماو بەڵگە بەپەلە حوکم بدەی ماڵی خۆت وێران بکەی و منداڵەکانت بێ ناز بکەی و خۆت بکەیتە بنێشتەخۆشەی سەرزاری خەڵك .ئەوەتا لەڕووداوی(بوختان کردن بۆ عائیشە)پێغەمبەرمان (د.خ) هیچ خۆی تێك نەداو بەڕواڵەت ڕوەخۆشەکەی جارانی هەربەردەوام بوو،بەڵام پاش ئەوەی کە تەواو بڵاوبۆوە پێغەمبەر(ﷺ)بەهێمنیەکی سۆزەوپێی ووت:(ئەگەرخوانەکردە هەڵەیەکی وات کردووە ئەوە تەوبەبکەو پەشیمان بەرەوە ،ئەگەرواشت نەکردوەئەوە خواپاکیت دەردەخات )ئیتر نازانم بۆچی پیاوانی ئیسلام چاو لە پێشەواکەیان ناکەن ،لەسەربچوکترین شت هەڵدەچن و ئارامیان لێ دەبڕێ و کێشەکان گەورە دەکەن وزۆرجاریش پەلاماری تەلاق ئەدەن و هەرئەوەشە کە دەبینی دادگاکان ڕۆژانە زۆرلەم سکاڵاوکێشانەیان ڕوو بەڕوودەبێتەوە ،بەڵام ئەگەر هەڵسوکەوتمان بەڕاستی موسڵمانانە بێ ئەوە بەختەوەر دەبین ، وەلە مێژووی زێڕینی ئیسلامدا زۆرنمونەمان هەیە کە لەپێناو پاراستنی بەختیاری خێزاندا چاویان لەزۆر شتی گەورە نوقاندووە و ئاویان کردووە بە ئاگردا نەك بەنزین.دیارە لەم بارەوە زۆروتراوە و نوسراوە نامەوێ زیاتر لەسەری بڕۆم و کۆتایی ئەم خاڵە دێنم بە وتەیەکی خاتوو(توروتید کس)کە دەڵێ : (بۆخاتری خوا بۆچی پیاوان تێناکۆشن لەپێناو بەختیاری خێزاندا ، ئەی بۆچی لەپێناودەسکەوتنی ملیۆنێ ڕیاڵدا زۆرتێدەکۆشن و ترسناکترین ڕێگە دەگرنەبەر،دەی کامیان بەختیاری زیاتر تێدایە؟ پوڵ وپارەیان ژیانی پڕلەشادی وبەختەوەری لەکۆشکی هاوسەریدا).

**دووەم : هەڵسوکەوتی ئافرەتان :**

لەپێناو بەختەوەری خێزاندا دەبێ هەردوولا دەست باری یەکتربگرن وئەرکی خۆیان بەرانبەر یەکترجێ بەجێ بکەن،بەنسبەت خوشکانەوە چەند شتێکی بچوك و ئاسان هەیە ئەگەر بیان کات من دڵنیای دەکەم کە مێردەکەی هەرگیز بیرلە جیابونەوە و ژن هێنان ناکاتەوە ،وەك: بەڕویدا هەڵمەشاخێ وبەرپەرچی نەداتەوە(زمان درێژی و دەمە دەمە) نەکات، لەناوخەڵکدابەدرۆی نەکاتەوە وگاڵتەی پێ نەکات، بێ گوێی نەکات لەکاتی هەبوون ونەبونداڕوخۆش بێت بەرانبەری،ڕێزی خزمەکانی بگرێ ، بەتایبەتی دایکی کەشتێکی لەبازاڕ هێنایەوە مەڵێ جائەوە چی یە وکێ دەیخوات، ماڵی باوکیشت خۆش بوێت،بیانوی زۆری لێ مەگرە،مەدحی بکە وبەسوکی سەیری مەکە،جابزانەکە هەمو دنیا(مَلِكةجَمال) بێت دەیگۆڕێتەوە بەتۆ؟بەڕاستی ئیتاعەکردنی ژن بۆ پیاوەکەی جگە لەوەی کەپێویستە لەسەری مایەی خۆشی وشادی و بەختەوەری یە.دەڵێن جارێك پاشایەك

خەیار دەخوات لەناویاندا خەیارێکی تاڵ دەکەوێتە بەردەمی خێرا بەخزمەتکارەکەی دەڵێ ئەم خەیارە بخۆ،ئەویش هەمووی دەخوات، پاشادەڵێ: نەگبەت خۆئەوە تاڵ بوو چۆنت بۆخورا؟خزمەتکارەکە لەوەڵامدا وتی: قوربان دەزانم تاڵ بوو بەڵام مادام هی دەستی تۆبوو زۆربەلەزەت بوولەلام !بەم هەڵوێستە لای پاشا زۆر خۆشەویست دەبێ و یەکسەرئازادی کرد چاکە چاکەی لەدوایە، بەڵام ئەوبڵێ سیرئەم بڵێ پیازبەوە ژیانەکەیان بەرەوگرفت وکێشەی خێزانی دەبات وخۆ شەیتانیش نەخەوتووە ژیانی ناو خێزان خۆشی و ناخۆشی تێدایە لەکاتی ڕودانی هەر ناخۆشیەك تۆ ئارام بگرەوبەقسەی خۆش لەگەڵی بدوێ چونکە وتراوە برینی شیرو تیر زوو چاك دەبێتەوە بەڵام برینی قسە چاك نابێتەوە، بۆیە قسەی خۆش و زەردەخەنە دوژمن دەکا بەدۆست ، پاشان خوشکەکەم هەوڵبدە وەك هاوسەرەکەت بژی خۆت لەو بەزیاتر مەزانە وەك پێشینانمان وتویانە(ئەگەر ئەو شوان بوو تۆنان بچنەوە) وەك بەسەرهاتی ژنە شوانەکە جارێك حەزرەتی عائیشە (خ) فەرموی بە پێغەمبەر (ﷺ) ئایا هیچ ئافرەتێك هەیە لەمن باشتربێت ، ئەویش فەرموی بەڵێ، بچۆلای ژنی فلأنە شوان، جاکاتێ کەچوو سەیری کرد ژنەکە لەبەرخۆرەتاودانیشتوە وئاووخواردنەکەشی لەبەرهەتاودانا وە! لێ ی پرسی بۆچی لەبەرئەم هەتاوە دانیشتوی؟وتی چونکە مێردەکەم لەبەرهەتاوە ! ئەی ئەوئاوونانە بۆلەبەرگەرماداتناوە؟ وتی:چونکە ئەو ئاوی گەرم دەخواتەوە ونانەکەشی لەبەرهەتاو لەکۆڵ بەستوە !! نەك بڵێ ی ئێستا مۆدیلی ئەوەیە وخانوو ماڵی فلأنە کەس ئاوایە ودەبێ بۆمنیش بکڕی بێگومان ئیمانداری سەرچاوەی حەیاو حورمەت و بەختەوەری وهەموو شتە چاکەکانە ، هەربیرو باوەڕیش دەتوانێ ئەو جۆرە ئافرەتانە دروست بکات لەهەموو سەردەمێکدا ، دەڵێن لەم سەردەمەی خۆشماندا برایەك لەگەڵ خێزانەکەیدا دەچن بۆلای دکتۆر پاش فەحس کردنی پیاوەکە،دکتۆرەکە دەڵێ چیتان لێ بشارمەوەوتۆ توانای پیاوەتیت نی یە، هەرلەوێ ئەوخوشکە بەئاراميیەوە بە دکتۆرەکەی ووت من (9) ساڵە ئەم حاڵەتە دەزانم ،دکتۆرەکە وتی:ئەی بۆچی وازت لێ نەهێناوە؟ وتی:تەنها لە پێناوبەختیاری وبەردەوامی نێوانماندا!!،دەی بۆچی هاوسەرەکانی ئەمڕۆ چاوناپۆشن لەشتە بچوکەکان وهێلانەی بەختیاری پێ دەشێوێنن و کە کاریش گەیشتە جیابونەوە یەکەم زەرەرمەند ئافرەتەکەیە کە کۆمەڵگای نەفامی بەچاوێکی ترسەیری دەکەن ! جا خوشکی بەڕێز تابۆت دەکرێت خۆت بکە بەزەوی بۆهاوسەرەکەت ئەویش خۆی دەکات بە ئاسمانی تۆ.

## سـکاڵاوچارەسـەری ... بۆژیانی بەختەوەری

ئەوەی تاکوئێستا ئاماژەمان پێ کردون فاکتەری ئیجابی بوون کەبەئەنجام دانیان بەختەوەردەبوین، بەڵام لێرەدا بەپێچەوانەی بەشی یەکەم ،ئاماژە بەچەندهۆکارێکی تردەکەین کە دەردو نەخۆشین وهۆکاری بەدبەختین (فاکتەری سلبی )ن بەدورکەوتنەوە لێیان بەختەوەردەبین ،ئەوانیش کۆمەڵێك دیاردەی خراپن وخەڵکێکی زۆرپێوە گیرۆدە بوون وسکاڵایانە لەبەریان،وەك (وەسوەسەو دڵەڕاوکێ ،هەڵچون و توڕەبوون ،بێ خەوی یان درەنگ خەوتن و درەنگ هەڵسان ونەکردنی نوێژی بەیانیان ،زۆر

پێکەنین بەقاقاو.. . ، خەڵکێکی زۆریان بەدبەخت وچارەڕەش کردووە لێرەدا لەپێناوی بەختەوەری وئاسودەیی داتیشك دەخەینە سەرهەریەکێ لەوگرفتانە: **یەکەم: دورکەوتنەوە لەووەسوەسەو دڵەڕاوکێ:** هەندێ کەس دوچاری قەلەقی و دڵەڕاوکێ وجۆرێك لەحاڵەتی وەسوەسەی شەیتانی دەبن وئەڵێ زۆرجاربیروخەیاڵی خراپ دێتەدڵمەوە ،لەنوێژدا یان لەحاڵەتی ئاسایی دا ،گومانم بۆدروست دەکات لەئیمانەکەم لەڕاستی دینەکەم یان دەمخاتە گومانەوە بەرانبەربەخوای گەورە !یان دودڵ دەبم لەبڕیارەکانی ڕۆژانەمداو..هتد ، دیارەسەرچاوەی هەموو ئەمانە(شەیتانە) کەبەردەوامە لەدژایەتی خۆی بۆمسڵمانان ، لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووەکە: {شەیتان دێتە لای کەسێکتان ودەپرسێ کێ تۆی دروست کردووە ؟ئەویش دەڵێ (الله)،پاشان دەپرسێ ئەی کێ خوای دروست کردووە ؟جائەگەریەکێکتان شتی لەوجۆرەی هات بەخەیاڵداوئەوحاڵەتەی بینی بڵێ :(امنت باللهِ ورسلهِ)واتە:ئیمانم هەیەبەخواو پێغەمبەر،بەوقسەیە شەیتان وازدێنێ } ،شیفای ئەم بارەدەروونیە تەنها لەبیروباوەڕی دامەزراو وپتەو دایە وەك لەسەرەتای کتێبەکەدا باسمان کردووە بەناوی (بیروباوەڕ ژیانە). جگەلەزیانی دەرونی وفیکری ،ئەم حاڵەتە کاریگەری خراپیشی هەیەلەسەرتەندروستی لاشە،لێکۆڵەرەوە ئەمریکیەکان لەزانکۆیەکی کالیفۆرنیا بۆیان دەرکەوتووە کەئەوانەی دوچاری وەسوەسەو دڵە ڕاوکێ بون زیاترلەخەڵکی تربەڕێژەی (40 0/0) دووچاری نەخۆشیەکانی دڵ دەبن وەك جەڵتە،بۆڕزگاربون لەم نەخۆشیە دەرونیە ئەم هەنگاوانە پەیڕەوبکە :

1)لەوکاتەدا بەرپەرچی بدەوەو بڵێ من ئیماندارم بڕوام هەیە بەخواو پێغەمبەرەکەی ﷺ(امنت بالله ورسولهِ) .

2)سێ جارلابکەرەوە بەلای چەپداو نەفرەت لەشەیتان بکە وبڵێ:(اعوذ باللهِ من الشیطانِ الرجیم)

3)بەشتێکی ترەوەخۆت سەرقاڵ بکە ودووربکەوە لەوبیروخەیاڵەچون ئەوەڕێگەیەکی شەیتانە بۆدژایەتی کردن .

4)بیرکردنەوەلەدروستکراوەکانی خوا،لەنیعمەتەکانی خوابەسەرمانەوە،نەك بیرکردنەوە لەزاتی خوا،چونکە ئەوە بابەتێکی زانستی وتایبەتە لەعەقیدەی ئسلامیدا بڕاوەتەوەومەلەوانی خۆی دەوێ

5)خوێندنی سورەتەکانی (اخلاص) واتە:(قل هوالله احد )،لەگەڵ هەردوو(قل اعوذ)وەکانی کۆتایی قورئان :واتە : سورەتی(الفلق ،الناس) وزۆریادی خوابکات.

6)خۆسەرقاڵ کردن بەئیش وکاری بەسود،وەك خوێندنەوەی زانست و زانیاری،چونکە زۆربەی گرفتەکانی ئێمە لەبێ ئاگایی ونەزانینەوەیە، هەرئەوەشە کەدەبێتە سەرچاوەی خەم وخەفەت وکێشەدەرونیەکان .بەلاَم مسوڵمان زانست وزانیاری وکاری ڕۆژانەی وهەرچی وبەرەوڕوی دەبێتەوە بە بەشێك لەبەندایەتی دەزانێ وبەوەش دڵخۆش وبەختەوەر دەبێ وخەمەکانی دەڕەونەوە،چونکە بێ ئیشی خەم وخەفەت و

نەخۆشیە،جاران گەردوعای خراپیان لەیەكێ بكردایە دەیانگوت بێ كاربێ.

**دووەم: دووركەوتنەوە لەتوڕەبوون:** ئەڵێ: من كەسێكی(عەصەبیم)

زووتوڕەئەبم وئیتربەدەست خۆم نی یە ئەكەومەجوێن دان وكوشتن وبڕین وتەڵاق خواردن وەك ئەڵێ (دۆودۆشاوتێكەڵ ئەكا) بومەتەكێشەبۆماڵ ومناڵی خۆم وبۆخزمانیش .!؟ بێگومان توڕبوون لەشەیتانەوەیە ،شەیتان لەهەر ڕێگەیەكەوە بۆی بكرێ گۆڵی خۆی دەكات وزەفەربەمسوڵمانان دەبات،لەدروست كردنی گومان وترس ودڵەڕاوكێ بێ یان لەڕێگەی توڕەبوونەوە بێت ،بەهۆی توڕە بوونەوەیە مرۆڤ دەكەوێتە هەڵەوتاوانی زۆرەوە وەك لەپێناسەكەیەوە دیارەكەچەندە كارێكی خراپەو زانایان فەرمویانە :(توڕەبوون دیاردەیەكە سەرەتاكەی شێتی یەو كۆتایی یەكەی پەشیمانی یە) لەفەرمودەی پێغەمبەردا (د.خ) زۆرباسی ئەم حاڵەتەخراپەكراوەوچارەسەریشی بۆدانراوە لەوانە:

1) وتنی(اعوذبالله من الشیطانِ الرجیم)،چون توڕەبون لەشەیتانەوەیە

2)دان بەخۆداگرتن وبێ دەنگی ووەڵام نەدانەوە،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (اذاغضب احدكم فلیسكت)گەركەسێكتان توڕەبوو بابێدەنگ بێت .

3) گۆڕینی حاڵەتی خۆی ،لەفەرمودەداهاتووە كەپێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی :(گەركەسێكتان توڕەبوو لەوكاتەدا بەپێوە بوو بادابنیشێ گەردانیشتوبوو باپاڵ بكەوێ)ئەوەبۆكەمكردنەوەی توڕەبونەكەو دوور كەوتنەوە لەمەترسی دەرەنجامەكانی

4) بۆپاراستن وبەگوێكردنی ڕێنمایی یەكانی پێغەمبەرمان (د.خ)، (ابوهریرە)بۆمان دەگێڕێتەوە كابرایەك هاتەلای پێغەمبەرو وتی: {اوصنی ..واتە،ئامۆژگاریم بكە،ئەڵێ چەندجار پێغەمبەر (ﷺ) لەوەڵامیا فەرموی :... لاتغضب..} (جامع الترمذی 371/4رقم /2020) توڕەمەبەلە گێڕانەوەیەكدا ئەڵێ سێ جاربەكابرای وت توڕەمەبە،كەبەڕاستی چەندجاردووپاتكردنەوەی ئەم ئامۆژگاریەبێ حیكمەت نەبووەو جێگەی سەرنجە! كابرادەڵێ دوایی بیرم كردەوە لەو وەسیەتەی پێغەمبەرﷺچونكەتوڕەبوون هۆكارو كۆكەرەوەی هەمووخراپەیەكە،وەلەفەرمودەیەكی ترداهاتووە كە پێشەوا كەمان فەرمووی بەیەكێ:{توڕەمەبەوبەهەشت بۆتۆیە..ولك الجنه }

گەورەیی پلەوپایەی ئەوانەی كەئارام دەگرن وتوڕەبوونی خۆیان دەخۆنەوە،پێغەمبەرﷺلەوبارەوە فەرمویەتی:{لیس الشدیدُ بالصرعةِ، انما ...}واتە:ئازائەوكەسەنی یە كەتوندوتیژوخێرایە ، بەڵكو ئازا ئەوكەسەیە كەلەكاتی توڕەبوندا خۆی دەگرێت، (ئازا كەسێكە لەكاتی بەڵاّ...خۆی بۆ بگیرێ ونەیكا بەهەڵاّ ) دیارە ئارام گرتنیش لەسیفەتی پیاوچاكانە كەخوالەوەسفیانە فەرمویەتی :﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء وَالضَّرَّاء

وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (آل عمران134) واتە: ئەوانەی ماڵ ئەبەخشن بەئاشكراو بەنهێنی ورقی خۆیان دەخۆنەوە ولەخەڵكی دەبورن وەخوای گەورە چاكەكارانی خۆش دەوێت .

5) بەئاگابون وبیركردنەوە لەدەرەنجامەخراپەكانی تورەبون وەك لەپێناسەیەكدا دەركەوتووە هەرچی لەكاتی تورەبوندا بكرێ كاری شێتانەیەوكۆتایی یەكەشی پەشیمانی یە كەپەشیمانیش سودی نی یەوخەجاڵەتی دنیاو دوارۆژە ، كەتورەبوو جوێن ئەدات ستەم وخراپەدەكات تاهەندێ جار دەكوژێ ودەبرێ ....،هەركام لەمانەیش ماڵ وێرانی وپەشیمانیە،بەتایبەت لەكێشەكۆمەڵایەتیەكاندایەكسەر سێ بەسێ تەلاق ئەخوات وپاشان دەبینێ ماڵی وێران بووە منالی دەربەدەربووە لەناو خەڵكداعەیبداربووە ..هتد،جائەگەر بیربكاتەوە لەئەنجامەكانی هەرگیزتورە بونەكەی جێ بەجێ ناكات ودان بەخۆی دادەگرێ وسەرەڕای ئەمانەش تورەبون كاریگەری زۆرخراپی هەیەلەسەرتەندروستی لاشەو دەبێتەهۆی بەرزبونەوەی پەستانی خوێن،زیادبونی لێدانی دڵ،تەنگە نەفەسی ،بەرزبونەوەی شەكرەوهەنێ جارجەڵتەی دڵ..،پەنابەخوا لەشەیتان ولەمەترسی وزیانەكانی تورەبون . دیارە بەرگری كردنی تورەبون وپلەو پاداشتی ئەوانەی ئارام دەگرن لەوكاتەداهەموی لەبەرخاتری بەختەوەری ژیانی مرۆڤەكانە ،بۆسەرفرازی دنیاو دوارۆژیانە قەڵغانی خۆ پاراستنیش لەتورەبون : دوعاوپاڕانەوە یە لەخواو پەناگرتنە لەشەیتان وپابەندبونە بەبنەماكانی ئیسلام وئیمان، خوایەداوات لێدەكەین كەدادپەروەربین لەكاتی تورەبون و ئاسایدا،لەحاڵەتی بون و نەبوندا ،لەخۆشی وناخۆشی دا. جگەلەمانەش ئەگەرلەكاتی تورە بوندائەوكەسەبتوانێ لەئاوێنەدا سەیرێكی خۆی بكات چ دەبێنێ ؟ بێگومان خۆی بەرچاودەكەوێ،رەنگی گۆڕاوە ..دیمەنی شێواوە .. دەموو چاوی ترش وتاڵ وسور هەڵگەڕاوە..وەكوشێت خۆی دێتەبەرچاو،دیارەخراپی وشێواوی ناوەوەی زیاترە لەهی دەرەوەی ، جالەم كاتەدا شەیتان چەندە خۆشحاڵەوبەئاسانی گۆڵی خۆی دەكات

بەتوندوتیژی كارنا چێتە سەر    ماربەقسەی خۆش لەكون دێتە دە ر

بەسەبروئارام ئەگەی بەمەرام    نەوەكو تێڵاو تفەنگ وخەنجەر

**سێ یەم: شەونخونی** : درەنگ خەوتن ودرەنگ هەڵسان بووە بە نەریتێكی زەمان ،كەكاتێكی زۆرلەتەمەنیان بەفیرۆدەڕوات و ماندوشەكەت دەبن لەپێناوی هیچداوكارەكەش پێچەوانەی سوننەت وفیترەتە،دیارەكەسێ تاكاتژمێر(1ـــ2) ی شەوبە دیارتلفزیۆن وسەتەلایت وئینتەرنێت دابنیشێ بێگومان نوێژی بەیانی دەچێت وجەستەی شەكەت دەبێت وبەختەوەرنابێت ئێستاخەڵكێك سكالا لەودیاردەخراپەدەكەن كەدەتوانین وەلامەكەی بەم شێوەیەبدەینەوە : شەونخونی دەكرێ بەچەندبەشێكەوە :

1) شەوبێداری لەخواپەرستی دا،یان لەبەرژەوەندی مسوڵمانانندا وەك جیهادوتێكۆشان،شەونوێژو قورئان

خوێندن ،ئەم جۆرەیان سوننەتێکی بەرزو بڵندەوکارێکی سوپاسکراوە بەمەرجێ واجبێکی شەرعی لەسەر نەچوێتی وەك نوێژی بەیانی ،دیارە ئەوەش لەبەشێکی شەودا دەبێ وڕێگەناگرێ لەحەوانەوەی جەستە.

2) شەونخونی دروست وبەومەرجەی نەبێتەلەدەستدانی فەرزێکی دینی وکارەکەشت تاوان وخراپەنەبێ ،وەك هاوڕێیەتی و قسەکردن لەگەڵ میواندا تاکو بێتاقەت نەبێ یان هەندێ لەئیش وکارەکانی گشتی دەکەوێتەشەوەوە وەك ئەوانەی لەخەستەخانەکان لەفڕۆکەخانەکان یان لەوێزگەی کارەباو هەندێ دەزگای ترکاردەکەن .

3) شەونخونی لە تاوان و خراپە و کات بەفیڕۆدان وتەمەن بەزایەدان دا کە مەبەستی ئێمەیە لێرەدا،کە پێچەوانەی سوننەتەو بووە بە مۆدیلی ماڵەکانمان ونیشانەی پێشکەوتنە!(کەدەبێ شەو درەنگ بخەون ولەبەر ئینتەرنێت و سەتەلایت وسەیری فلیمی شەو بکەن و یان شەوێکی خۆش بەسەربەرن لە قوماروياری و خواردنەوەی حەرام یان بەدەم شەوچەرەوەغەیبەت و بوختان و باسی ئەم و ئەو ...) ئەم جۆرە شەونخونی یەحەرامە و تاوانە، کە گەنجی وبێکاری و دەوڵەمەندی و لەگەڵ نزمی ئاستی هۆشیاری فاکتەری سەرەکین بۆ ئەودیاردەیە . دیارە داب و نەریتی ڕۆژگارگۆڕاوە وهۆکارو ئامێرەکان ڕێگە خۆشکەرن بۆدرەنگ خەوتن ، شەو وەك ڕۆژی لێهاتوە ، سەردان و گەڕان لەشەواندایە وبەڕۆژ ئەوبوارەیان نییە وهەندێ لە ئیش وکارەکانیش کەوتونە شەو بەلاَم بۆچارەسەری ئەم حاڵەتە پێویستە ئێمەی موسڵمان سنورێکی بۆدابنێین و سەرنجی ئاکامە خراپەکانی بدەین وەك:

1) لەدەست دانی واجباتی شەرعی ،وەك فەوتانی نوێژی بەیانیان ، کەدرەنگ بخەوی بێگومان درەنگ هەڵدەستی ، بێبەش بوون لە نوێژی جەماعەت ،گەرنوێژەکەشی بکات لێ ی بێئاگایەوبەهۆی کەم خەوی گێژو وڕدەبی و خۆشی نازانێ چۆن سوجدە و ڕکوع دەبات ،چونکە جەستەی شەکەتوو ماندووە بە هۆی کەم خەوتن و دەرونیشی نائارامە بەهۆی سەرقاڵ بوونی شەوانەی چونکە کارەکەی پێچەوانەی سوننەتەوئەگەر زوو بخەوی و زووهەڵسی ، ئەوکاتە هەست بەگورج و گۆڵی و چالاکی دەکەیت

2) زیانەکانی تەندروستی جەستە ولاشە ،لەبەرئەوەی کارەکەی پێچەوانەی سروشت و یاسای بونەوەرە کە خوای گەورە ڕۆژگاری بۆژیان و هەوڵدان دروست کردووە و شەویش بۆحەوانەوە: (وجعلنا الليل لباساً و جعلنا النهار معاشاً ) بۆیە دەبینی ئەوانەی کارەکانیان بەم شێوەیە پێچەوانەی سوننەتی ژیانە بەردەوام هەست بەسەرئێشە و بێ تاقەتی وشەکەت وماندوویەتی دەکەن وتەندروستیان باش نی یە ،دیارە هەمووشمان ئەوە دەزانین کەیەك کاتژمێر خەو لەشەودا چێژ و ئیسراحەتی زیاترە لە سێ چوار سەعات خەوی ڕۆژ .

3) ئەوانەی شەو کەم دەخەون، بەڕۆژ سەرکەوتوونین وکەمتەرخەمن لە کارەکانیاندا،جائەوکەسە

ئەگەركارمەندی فەرمانگەیەك بێت ناتوانێ كاری هاولأتیان راپەڕێنێ،گەر قوتابی بێت خەودەیباتەوە لە كاتی وانەكەی دا .

4) جگەلەوەی كەناتوانن بەشێكی كەم لەشەو زیندوو بكەنەوە ،تەنانەت نوێژی بەیانیانیش دەچوێنن چونكەبەری بەیانی خەوتوون،بێ بەش دەبن لە بەرەكەتی زوو هەڵسان لەبەیانیاندا ،لەفەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هاتووەكە بەرەكەت وپیرۆزی لەزووهەڵسانی بەیانیاندایە :{بورك لامتي في بكورها} (صحيح الجامع/2841)، بەرەكەتی عیبادەتی بەیانیان كەنەریتی پیاوچاكانە ،وەك چۆن خەوی بەیانیان خۆشە،دڵنیابە هەڵسانەكەی خۆشتروچاكترە گەرشەو زووخەوتبی،دوای نوێژ قورئان خوێندن وزیكروعیبادەت كەخۆراكی رۆحە خواردنەوەی پەرداخێ ئاوو ئەنجامدانی وەرزشی بەیانیان بۆ زیندوڕاگرتنی لاشەت وژینگەی بەیانیان پاك وبێگەردەو مێشك ئامادەیەبۆ وەرگرتنی خوێندنەوە بەتایبەت كاتی سەعی كردنی خوێندكاروخوێندەوارە تاكاتی خۆرهەلأت وپاشان خواردنی نان وچایی و هەم زوو ڕۆیشتن بۆ كاری رۆژانەی وئامادەبوونی لەكاتی خۆی دا ئەوەیە بەرەكەتی دنیاو دوارۆژ،جابەداخەوەكە دیاردەی درەنگ خەوتن زۆربلأوە لەناوماندا بەهۆیەوە بەیانیان مزگەوتەكان چۆڵن و دام و دەزگاو فەرمانگەكانیش درەنگ دەكرێنەوە كەبەوە زیان بە دین و دنیامان دەگات و ولأتمان لەڕوی خزمەتگوزاری و ئابوریەوە ئیفلیج دەبێت ولەكاروانی ژیان جێ دەمێنێت وەك لەم رۆژگارەدا دەبینین ! جائەگەرئەوكەسانە دەرەنجامەخراپەكانی شەونخونی بێننە بەرچاوی خۆیان و بیربكەنەوە لەو هەموو زەرەدو زیانە هەمەلایەنە، ئەوەهەرگیزبەدەستی خۆیان و بەچاولێكەری مالی خۆیان وێران نەدەكرد بەداخەوە كەئێستا هەرچەندە بانگەشەی عیلم و عەقڵ دەكرێ بەلأم كاریان پێناكرێ جگەلەهەواو ئارەزوو چاولێكەری نەبێت ...!!

سَهرالعيونِ لغيروجهكَ ضائعُ .... بُكائهن لغير فقدكَ باطلُ

## ئەوشـــتانەی دڵ رۆشن ئەكەن

بەشیعرەكانی زانای بەغدایە(1)

| | |
|---|---|
| سەرجەم بزانن هۆی بەختەوەری | كۆتایی دێنم ئومێدم وایـە |
| ئەوفەرمانانەی ڕۆشن ئەكەن دڵ | بۆژیانی خۆشی پڕلەسەروەری |
| یادو زیكری حەق چرای دەروونە | یەكەم صەڵەوات لەشاهی ڕەسوڵ |
| ئایاتی قورئان سەرچاوەی نورە | ژیرئاگادارەلەم چەن وچونـە |
| زانینی مەعنای نورلەسەرنورە | خوێندنی بۆ دڵ مایەی سرورە |
| دڵ ڕۆشن ئەكاتەقواوعیبادەت | بێ نورەهەركەس لەمەعنای دورە |
| نوێژی نیوەشەو،بێداری سەحەر | نوێژی چێشتەنگاو،نوێژی جەماعەت |
| | ئەبنە ڕوناكی بۆدڵی بەشـەر |

ڕێزوگوێ گرتن لـەدایك وباب — دڵ ڕۆشن ئەكەن بێ حەددوحیساب
هاوڕێی ی چاكان ڕۆشنـی دڵـە — دەوای ژەنگی دڵ زانای كامڵە
دڵ ڕۆشـن ئەبێ وەكو ئاوێـنە — مادام تیانەبێ بەخیلی وكینە
كەم خۆری وپاكی وحەلاڵی تەعام — دڵ ڕۆشن ئەكەن بێگەردوەكوجام
بناغەی ساغی كەم خۆراكی یە — زۆرخۆری مایەی دەردەناكی یە
خەوی مامناوەند نەزۆرو نەكەم — دەوامـەبۆگیان،دەوایەبـۆغەم
مرۆیی بەئەدەب عومری زیادە — بێ شەرم وحەیا عومری بەربادە
شكارجاربەجارمایەی شادیە — صەییادی دائـیم نامورادیــە

1.م.مەلاعبدالكريم

**بابــەت — پێرســــــت — لاپـەڕە**

## سـەرچاوەکان :

الوسائل المفيدة للحياة السعيدة /عبدالرحمن ناصرالسعدى.

شـكاوى وحلول / محمد صالح المنجد .

لا تحزن / د. عائض القرنى .

**گەشبین بە.. دڵنیابە.. مزگێنی بە.. ڕووخۆش بە.. ئارامگربە.. بـەختـەوەربـە...**

﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾


- ناوی کتێب : هۆیەکانی بەختەوەری
- ناوی نوسەر : مەلا ئەحمەدی قامیشی
- تایپ : ڕێزان قامیشی
- تیراژ : (1000) دانە
- ساڵی چاپ : (2008) ز
- ژمارەی سپاردن: (209) ساڵی (2008)ی پێدراوە .